ڕۆڤار 42

# مەنسوری یاقوتی

## مرۆڤی چیرۆك و چیرۆكی مرۆڤ

بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە و هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوو مانگ جارێك دەریدەكات






سەرپەرشتیاری گشتی
شێرکۆ بێکەس

ڕاوێژکار
ئەکرەم قەرەداخی

سکرتێری ڕۆڤار
یاسین عومەر

سەرپەرشتیاری هونەری
قادر میرخان

مۆنتاژی کۆمپیوتەر
ئاسۆ سەعید

سەرپەرشتیاری چاپ
فەرهاد ڕەفیق

ڕۆڤار بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوومانگ جارێك دەریدەکات



ناونیشان
سلێمانی- شارێی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

لە دەرەوەی وڵات
Tel: 00441628477660
Fax: 00441628486008

Web Site
www.sardam.info

Email
Sardam@sardam.info



چاپخانەی ڕەنج


## ژمارەکانی ڕابردوو

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەمەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، جەلالی میرزا کەریم، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە ساڵح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەمەد، مەحمود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵلا پەشێو، جگەر خوێن، بابە تاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی.

# لە گوزەری بادا

## بیۆگرافیای مەنسوری یاقوتی، بە پێنوسی خۆی

و: جەلیل ئازادیخواز

ژیانی من بە شێوەیێکی گشتی و ورد لە سێ کتێبدا نووسراوە کە هیچکامیان تا ئەمڕۆ بڵاونەکراونەتەوە. ١- پاییز و پەپوولە ٢٠٠ لاپەڕە بیۆگرافی ڕێگانەدراو بۆ چاپ

٢- لە گوزەری بادا. ٢٠٠ لاپەڕە، چیرۆکی درێژ. ڕێگانەدراو بۆ چاپ.

٣- شەوی داڵەکەرخۆرە. ٣٠٠ لاپەڕە، کۆمەڵە داستان. نەکونجاو بۆ چاپ.

ژیانی من هەر وەك گوێوژێکی کێوی وایە کە لە لابەلای زنار و تاشەکانی زاگرۆسەوە سەوز بووە و بێ پسانەوە گژەبا رای دەوەشێنێ و زریان و بەفرەلێز و شەستەبارانی گورزوەشێن نەوازشیان کردووە.

لە ڕۆژی ٥ی ڕەشەمێی ساڵی ١٣٢٧ لە گوندی «کێوەنان» لە دایك و باوکێکی هەردوو کورد و پشتاوپشت کورد لە دایك بووم. باوکم لە گوندی «سیرکۆ»وە دێت بۆ کێونان و لەوێ ژن دێنێ. ڕەچەڵەکی ئێمە لە بنەڕەتدا سەر بە ناوچەی «کولیایی»یە کە لە باکوورەوە دەگاتە قوروە و لە خۆرهەڵاتەوە سنقور و لە باشوورەوە کرماشان و لە خۆرئاواوە کامیران. زێدەکەم زنجیرە چیایەکی بەرز لە بارەشیان گرتووە. لەوانە چیای بەرزی «داڵەهۆ» و بەرزاییەکانی «کەشکەمیر»

هۆڵە و کێوەنان بنەیل کەشکەمیر

هوێردە ئێلاخان منیش کردە پیر



لە دەورانی منداڵیا بەو ئەفسانانە گەورە بووم کە دایکم دەیانی گێڕایەوە و باڵاکردنم هاوڕێی خوێندنەوەی شانامەی کوردی کوڕی شەوان بوو.

ئێستاش زرانەوەی ئاهەنگ و ئاوازی ئەو شانامە خوێندنەوەیە لە گوێمدا دەزرێتەوە و هەستێکی سەیر و رازاوی لە گیانمدا بڵێسە

دەکێشێ و بێقەرارم دەکا. ئێستاش نازانم بۆچی باوکم ئەوماڵەی کە من تیایا لەدایك بووم، لەگەڵ زەوین و باخی هەڵووژە و کانیدا بە جێی هێشت. بە داخەوە ئیمە کۆچمان کرد بۆ کرماشان. لەو شارەدا گالێسکە و گاریەکان لە هاتووچۆدا بوون و باران دەباری. کاتێك کە گەیشتینە شار لە کۆڵانی (پشت بە دەنە) لە پاڵ مردووشۆرخانەیەکدا شوێنمان گرت. لە قوتابخانەی «داریوش»دا دەرسم دەخوێند. ئەم قوتابخانەیە هینی ماڵی کامکار بوو کە بنەماڵەیەکی کەلتووریست و شارستانیخواز بوون. لەو قوتابخانەیەدا «ئەمیری کامکار» بە داستان خوێندنەوە بە شێوەیێکی جوان و سەرنجڕاکێش کە بۆ ئێمەی دەخوێندەوە منی بەرەو کتێب و خوێندنەوەی کتێب ڕاکێشا. کتێبخانەیەك بوو کە شەوی بە ڕیاڵێك کتێبی ئەدا بە کرێ. هەموو کتێبەکانی ئەو کتێبخانەیەم خوێندەوە و ئەو ساڵە لە قوتابخانەدا کەوتم. ساڵی دوایی هەموو کتێبەکانی کتێبخانەیەکیترم خوێندەوە کە کتێبخانەی «ئاخەلیل» بوو کە ئێستاش ئاخەلیل هەر ماوە. بێ ئامان و پسانەوە کتێبم دەخوێندەوە. هەرچی دەگەیشتە دەستم



دەخوێنەوە. مامۆستایەکی ئەدەبمان هەبوو ناوی «سادق» بوو. دنەی دام کە بنووسم. قۆناغی دواناوەندی و ئامادەییم لە دواناوەندی «کەزازی»دا دایە سەر کە کۆی مامۆستای خوێندەواری چاکی لێبوو، وەك:

١- ئەسغەری واقدی، شاعیری کرماشانی

٢- عەباسی سەرمەدی، کۆکەرەوەی کۆمەڵە هۆنراوەی هۆنەرانی ئەمڕۆ

٣- مەسعوودی گوڵزاری، مامۆستای مێژوو، توێژەری مێژووی کرماشان

عەباسی سەرمەدی مامۆستای فەلسەفە بوو، رۆڵێکی یەکجار کاریگەر و گرینگی لەسەر ژیان و چارەنووسی من دانا. بە تایبەتی ژیانی ئەدەبی.

قوتابخانەی کەزازی دوو خول زیندانی سیاسی لە قوتابخانەکەی دایە دەرەوە. ١٩ ساڵ بووم کە سەرم لە ساواك و زیندان و پۆلیس و دادگای سەربازی دەرهێنا. لە خولی تاقیکردنەوەدا بووم و خەریکبووم وڵامی پرسەکانی فەلسەفەم ئەدایەوە کە عەباس سەرمەدی هات و وتی: کارگێرانی «ساواك» (پۆلیسی سیاسی دەسەڵاتی شا) لە نوسینگەی بەرێوەبەر چاوەرێت دەکەن.

ئێمە یەکەم تاقمی زیندانیی سیاسی بووین دوای رووخانی دەوڵەتی میللی دوکتۆر موسەدق. ئەوساڵەش هەر کەوتم. بە شێوەی هەمیشەیی و رەوتی خۆیان دەستیان دایە کۆیەکی زۆر لە فایل دروستکردن و ساختەکردن بۆ ئێمە کە کۆمەڵێ قوتابی بووین.

دەورانی «سپادانش»م (مامۆستای گوند لە بری سەربازی) لە شاری «هەشترود»دا یا لە «سەرداسکەند» لە ئازربایجانی خۆرهەڵاتدا دایەسەر و ساڵی ١٣٥٠ کە بە راستی عاشق و ئەوینداری مامۆستایی بووم و سەرمەشقێکی وەکو عەباسی سەرمەدی و سادق و ئەسغەری واقدی خولیا و مەکۆی سەرنجم بوون، چووم بووم بە مامۆستا. مامۆستای گوند لە ناوچەی کولیایی و گوندی «چوارملان» لە نزیك زێدی خۆمەوە. لە گوندی چوارملاندا بۆ ماوەی سێ ساڵ بە هەموو شەوق و تاقەت و ئارەزووی خۆمەوە...

ئارماناخوازی لاویەوە وانەم وتەوە و لە ناو فرمێسك و گریانی خەڵکدا پاش ماڵئاوایی چووم بۆ گوندی «مەیدان» لە نزیك سنووری قوروە. لەوێ بوو کە داستانی درێژی «چرایەك بە سەر مادیان چیاوە»م نووسی. بڵاوبوونەوەی ئەم کتێبە هەندێ لە دەربەگە توند و تیژەکان و ساواکی دژم هێنایە جموجووڵ و لە ژێر گوشاری ساواك و هەندێ لە دەربەگەکانی ناوچە ناچار بووم ماوەیەك لە شاری سونقووردا دەرس بڵێمەوە. لەوێش لە ژێر گوشاری ئێسکشکێنی پۆلسی سیاسیدا ناچار بووم بەرەو کرماشان کۆچ بکەم و بوومە مامۆستای قوتابخانەی «کۆیا».

ساڵی ١٣٥٢ یەکەم کۆمەڵە چیرۆکم بە ناوی «زام» بڵاو بۆوە. ئەم کتێبە لە لایەن ناوەند و کۆڕ و کۆمەڵ و رووناکبیر و خەباتکارانی ئەو سەردەمەوە پێشوازی باشی لێکراو. «باقری موئمنی» توێژەر و رخنەگری ئەدەبی و نووسەر کە لە بنەڕەتدا کرماشانیە کتێبەکەی خوێندبووەوە.

لە کۆمەڵەی زامدا چیرۆکەکانی «فیسقە، هەنگی ژێر، گورگ» سمبولیکن و داستانی «ژێرپرد، ژیری درەخت» رەگەزی سوررئالیستییان هەیە و چەند داستانی رئالیستی کە لە ئاخاوتنێکی رووبەڕوودا باقری موئمنی لەسەر رئالیسم قوتابخانەی قۆناغسازی سەردەم جەختی کردەوە، لە ژێر کاریگەرێتی روانگە و بۆچوونەکانی موئمنیدا رەوتی بەرهەمەکانی من رەنگ و بۆی رئالیسمیان بە خۆوە گرت و بووە مایەی ئەم بەرهەمانەی خوارەوە کە تا کاتی سەرهەڵدانی شۆڕشی ئێران هاتوونەتە دنیای بوونەوە.

١- «گوڵخاس»، کۆداستان تا چاپی حەوتەم.

٢- «منداڵی من»، کۆداستان تا چاپی یازدە.

٣- «چیرۆکەکانی ئاسکدەرە»، کۆداستان تا چاپی سێیەم.

٤- «ساڵی کۆرپە»، کۆداستان تا چاپی یەکەم، بەرەوەی خەڵاتی باشترین کتێبی ساڵ، هەڵبژێراوی لیژنەی کتێبی منداڵ.

٥- «پاجۆش»، چیرۆکی درێژ چاپی هەشتەم.

٦- «لە ژێر خۆردا»، چیرۆکی درێژ چاپی یەکەم.

٧- «چرایەك بە سەر مادیان چیاوە»، چیرۆکی درێژ، چاپی سێیەم.

لەگەڵ هەستانەوە و راپەڕینی خەڵکدا لە دەوڵەتی سەربازی «ئەزهاری»دا دەستگیر کرام و هەموو کتێبەکانی کتێبخانەکەم لە لایەن ساواکەوە تاڵان کرا و باری دوو پیکاپ کران و بران.

جارێکی دیکە زیندانی «دیزڵئاباد» و بەسەربردنی ماوەیەکی تری ئەمەن و پاشان رەوانەی «کۆمیتەی هاوبەشی دژە خراپکاری» کرام لە تاران. بە هاتنە سەر دەسەڵاتی دەوڵەتی «بەختیار» دەرگای هەموو بەندەکان کرایەوە و منیش ئازاد بووم.

ماوەی شەش مانگ لەسەر رۆمانێ بە ناو «جووتیاران» کارم کرد. ئەم رۆمانە وێنەیەکی گشتی و هەمەلایەنەیە لە ژیانی جووتیارانی کوردی ناوچەی کولیایی.

وێنە و روالّتبەندییەکی تەواو لە سیستەم و رێکخراوەی ئەرباب و رەعیەتی. ئەم کتێبە دوای شۆڕشی ئێران لە لایەن ناوەندی بڵاوکردنەوەی «شەباهەنگ»ەوە بڵاو کرایەوە.

لە مانگی خەرمانانی ساڵی ١٣٥٨دا بڕیاری لەسەرکار لابردنم کە دێرێ زیاتر نەبوو، بێئامادەبوونی خۆم لە کۆبوونەوەیەکدا بە پێی روانگە و بۆچوونی شوورای شۆڕش دەرکرابوو درایە دەستم و لە کاری مامۆستایی دەرکرام. مامۆستاییەك کە بە راستی خۆشم دەویست و عاشقی بووم و بەشێك بوو لە ژیانم.

نە دادگایی کردنێ، نە پرسێ نە وەڵامێ، نە هۆیەك نە بەڵگەیەك، نە تاوان خستنە پاڵێ، بە خۆم وت لێی گەڕێ، مێژوو لەمەڕ ئەم بڕیارە نادادوەرانەوە داوەری خۆی دەکات. بێ ئەوەی کوێ بدەمە تازە بە دەوران کەیشتووان کە هەموو پێشینەی فەرهەنگی منیان سڕیبووەوە بێ ئەوەی لە هیچ کارێکیتردا پسپۆڕ بم، چون هیچ پیشەیەکم نەدەزانی ناچار و نابەدڵ بەرەو دنیا و ژیانی کرێکاری کشام و چام.

لە کۆمپانیایەکی رێگەوباندا کارم دەکرد کە لە کاتی تەقینەوەی نووسینگەی ناوەندی «حیزبی جمهوری ئیسلامی» لە تاران هاتن بە دوای مندا و ئەم کارەساتە بووە بەهانەیەك بۆ کوشتن و بڕین و لەناوبردنی نیشتمانپەرستان و ئازادیخوازان و ئازادیویستان لە سەراسەری وڵاتدا. چەند رۆژ دوای ئەو تەقینەوەیە کە تا ئێستاش روون نەبووەتەوە کە کاری کێیە، چەکدارانە و بە کۆمەڵ هەڵیان کوتایە سەر ماڵەکەم و هەموو ماڵەکەیان هەڵوەشاند و خراپ کرد و گەڕان، کە دیسانەوە کتێبخانەکەم تاڵان کرا. چون دەستیان بە خۆم نەکەیشت، هەموو بنەماڵەکەیان بە بارمتە گرتم و رەوانەی زیندانیان کردن. بێ ئەوەی بچووکترین تاوان و گوناهیان هەبێ.

ناچار بووم لە شارەکەی خۆمدا نەمێنم و بڕۆم بۆ تاران. سێ ساڵی تەواو لە کارخانە و کارگە و ناوەندەکانی بەرهەمهێنانی تاراندا لە «یافتئاباد» و «عەلیسەوز» و شەقامی یەکیەتی لە رۆژهەڵاتی تاراندا کرێکاریم کرد. فەراشی، پاسەوانی، ئاسنگەری و کۆڵبەریم کرد.

هەم لە تاڵانی ساڵی ٥٦دا و هەم لە تاڵانی ساڵ و هاوینی ٦٣دا هەموو دەستنووس و داستان و رۆمان و تەرح و فیشەکانم تاڵان کران و بە چەپاو چوون.

لە کارخانەدا بارودۆخ جۆرێ نەبوو کە بتوانم بخوێنمەوە یا بنووسم، هەموو هەویا و ئەوینی من نووسەری بوو، ئەویشیان لێ سەندم. رۆژی ٦ی خاکەلێوەی ساڵی ٦٣ یەکێ لە ئاشناکانم کە پێوەندی هاوەڵی و دۆستایەتی لەگەڵم هەبوو بە داخەوە کورد و خەڵکی گوندی «پارینە» بوو، هاورێ لەگەڵ چەند مەئموور لەناو کارخانەدا دەستگیریان کردم. وتبووی کە من هەڵهاتووم، هەر ئەم رستەیەی ئەو بووە هۆی ئەوەی کە بمدەن بە دادوەری شاری کرماشان و وەك هەڵهاتوویەك بمگێڕنەوە بۆ ئەوێ. داوایان لێ کردم بچمە سەر تەلەفزیۆن و قسان بکەم. قبوولم نەکرد و رەدم کردەوە. چوار ساڵی تەواو رۆح و رەوانیان خستە ژێر گوشارەوە، دەیانویست لە سەر شەڕی ئێراق و ئێران رۆمانێك بنووسم، قبوولم نەکرد و نەکرد، ئامانج بوو بە پێنج ساڵ زیندان.

باشترین دەورانی تەمەن و ژیانم کە دەکرا تەرخانی نووسین و بەرهەمهێنانی ئەدەبی و ئافراندنی کەلتووری بکرێت، بە با چوو.

کاتێك کە لە زیندان هاتمە دەرەوە، دۆستانی خەباتکاری ڕێگای ئازادی پێشوو! خۆیان لێ دوور دەخستمەوە، چەسپابوون بە ژن و ژیان و کار و مەقامەوە. هەموو ئەو ئاوات و ئارەزووە جوانانەی کە لە پێناویاندا گاڵتە و سووکایەتیان بە دیتران دەکرد و شەقڵیان پێوە دەنان و جنێویان ئەدانێ، با بردبوی، فڕێ درابوونە گڵەجانەی ناو و نانەوە.

ئیتر کەس «مەنسووری یاقووت»ی نەئەناسی، یا نەیدەویست کە بیناسێ. دیسانەوە ناچار بووم بۆ درێژەی نان و ژیان روو بکەمەوە کارخانەکان.

پێنج ساڵ لە تەمەنم لە ناوەندی کارەبای بێستووندا لەناو چوو. هەشت ساڵ لە کارخانەی ئاردی شاری سونقوردا با بردی. هیچکەس نەیدەویست بۆ چرکەساتێ بیرکاتەوە کە



مەنسووری یاقووتی نووسەرە و دەبێ کاتێکی بۆ بلوێ و لە گۆشەی ماڵێکدا خزمەتی ئەدەبی وڵات بکات.

لەگەڵ ئەم هەموو تەنگەژە و گرفتاریانەدا کۆمەڵە چیرۆکی «تووشای باڵندەی غەریبی زاگرۆس» نووسرا و بڵاوکرایەوە و لە زەمین و نوێنی کار و ڕەنج و زەحمەت و دەرد و ئازار و برسیەتیەوە کۆبەرهەمێك لەدایك بوون و سەریان هەڵدا:

١- ئەفسانەی سی ڕەنگ، چیرۆکی درێژ

٢- تراژێدیای یەدگرد، ڕۆمانی مێژوویی ڕێگەنەدراو بۆ چاپ

٣- پاییز و پەپوولە، بیۆگرافی، ڕێگەنەدراو بۆ چاپ

٤- لە گوزەری بادا، چیرۆکی درێژ، ڕێگەنەدراو بۆ چاپ

٥- کۆڵان بە کۆڵانی کرماشان، کۆمەڵە چیرۆك، ڕێگەنەدراو بۆ چاپ

٦- ئاگر و ئاواز، کۆمەڵە چیرۆك، ڕێگەنەدراو بۆ چاپ

٧- شیعر و جادوو، داستانی درێژ، ڕێگەنەدراو بۆ چاپ

٨- هێڵی سنوور، کۆمەڵە داستان

بە هۆی بڵاونەبوونەوەی کتێبەکان و ڕێگانەدرانیان، هەندێ قاوی وا داکەوتووە و بڵاوبۆتەوە و تا رادەیەکیش وەك راستی و واقعیەت قبووڵ کراون. وەك ئەوەی کە گوایا من مردووم، یان لە

هەندەرانم و لەوێ دەژیم. کە لە زیندان هاتمە دەرەوە هەواڵێك لە رادیۆکانی دەرەوەی وڵات بڵاو کرایەوە کە گوایا من (شەهید) کراوم!

وەك دەڵێن لە هەندێ وڵات، ئێرانیەکانی ئەوێ و لایەنگرانی ئەدەب کۆڕ و کۆبوونەوەی ماتەمینیشیان بەرێوە بردووە. خۆم بە گوێی خۆم ئەم هەواڵەم لە یەکێ لە رادیۆکانەوە بیست. ئەم هەواڵە بڵاو کرایەوە و بەرپرسانی ناوەندەکانی بڵاوکردنەوەش نەیانوێرا نە تەنیا کتێبەکانم چاپ کەن، بەڵکو ناویشم قەدەغە کرا و کەس ئامادە نەبوو ناوم بێنێ. ئێستا زۆرێ لە بەرپرسانی ناوەندەکان باوەڕ ناکەن کە زیندووم. ئەوانەی کە ئەم پرۆژەیان گڵاڵە کردبوو، توانیان ناوی مەنسووری یاقووتی لەبیر و یادی چەندین ئەوە پاك کەنەوە. لەم ساتەوەختەشدا گۆڕەپانەکەیان سپاردە کەسانێك و هەوڵ و دەرفەتی تەواویان بۆ رەخساندن تا خۆ بنوێنن و لۆتیگەری کردەوە و ئاکاریان دەنگ باتەوە. هاورێ لەگەڵ ئەم پرۆژەیەدا لە لێشاوی نووسین و بەرهەمەکانی خۆیاندا دەستیان دایە هێرش و رووخاندنی کەسایەتی من و بەرهەمەکانم. وەك کتێبی: «ئێمەش جەماوەرێکین».

لە زینداندا دووچاری نەخۆشی سەرع بووم، جۆرە سەرعێکی تایبەتە، ناچار و تا دواساتەکانی تەمەن دەبێ دەرمانێ بەکار بێنم بە ناوی «کاربامازیبین» یا «ترگتول».

بەرهەم و بەرەنجامی پێنج ساڵ زیندان و یەکسلوولی نەخۆشی گورچیلە و کەوتنی ددانەکان و لەناوچوونی لەسە و کەمبوونی حوکمی چاوەکانم.

نە ددان ما و نە حوکمی چاو و نەددەم و نە لێو و...

ئەو قامچیانەی کە بە وایەری کارەبا ئەیاندا لە ژێر پێم، ئێستا خەریکن کاریگەرێتی خۆیان دەردەخەن.

ئەمە ئەنجامی بەرهەمی ژیانی نووسەرێکە لە وڵاتێ لە وڵاتەکانی دنیای سێیەمدا کە بە خاتری نووسینی چیرۆك دەبێ ئاوەها سزا ببینێ و پاداش بدرێتەوە تا ئیتر هیچکەس نەوێرێ بەرەو خوێندنەوە و کتێب و بەدەستهێنانی ئاوەز و زانست و خولقانی ئەندێشە بروات.

من بێ ئەوەی ئاگاداری ئەم هەموو سزایە بم لە تەمەنی نزیك بە چواردە ساڵیەوە سەرقاڵی کاری نووسین بووم. یەکەم کورتە چیرۆکم کە بڵاو کرایەوە ناوی «ماشای خان» بوو. کە لە لاپەڕەی ئەدەبی «دەریچە»دا لە گۆڤاری «تاران موسەوەر»دا کە «حەسەنی شەهرزاد» بەرێوەی دەبرد بڵاو کرایەوە.

شەهرزاد لە لاپەڕەکەی خۆیدا هەندێ بەرهەمی دیکەی منی بڵاو کردەوە. من زۆرتر لەوەی کە بنووسم دەمخوێندەوە. لە هەموو بوارەکاندا، فەلسەفە، کۆمەڵناسی، ئابووری، رەوانناسی، بە تایبەتی مێژوو و بە شێوەیەکی زۆر تایبەت مێژووی کۆنی ئێران. پێم وایە لە دەورانی لاویدا زۆربەی هەرە زۆری ئاسەوارەکانی هۆنەرە کلاسیکەکانم خوێندبۆوە. چیرۆکێ لە گۆرکێ نەما کە من نەمخوێندبێتەوە. بەرهەمی نووسەرانی دنیا لە رووس و فەڕانسا و ئەمریکا تا ئەو جێگایەی کە وەرگێڕابوون و لە دەستابوون خوێندمەوە. بەڵام نووسەری ئەزموونی ژینی دەوێ کە دەبێ لە پێناویدا ژیان بکەیتە قوربانی. پشتیوانی ئاوەزی و فکری هونەری نووسینە کە دەبێتە کتێب. لە بەرهەمێکدا کە گەرما و خوێنی ژیان نەبێت و خۆی نەنوێنێ ئەو بەرهەمە هەرچەندە پسپۆڕانە نووسرابێ لە دوا ئاکامدا ناتوانێ بەرهەم و خولقاوێکی کاریگەر بێت.

رەخنەی بنەڕەتی و هەمەلایەنە لە پاڵاوتن و پێشخستنی بەرهەمدا رۆڵی کاریگەر و گرنگی هەیە. ئەم رەوت و رەوەندە ئازاراویەی ژیان کاریگەرێتی خۆی لەسەر دانەدانەی چیرۆك و هەموو بەرهەمە خولقاوەکان داناوە. رەخنەگری ئەدەبی ناتوانێ بێ خوێندنەوە و لێکدانەوەی قۆناغ و دەورانەکانی ژینی نووسەر و پرۆسەی بوون و ژیانی لەسەر بنەڕەتی ئەگەرە زەینیەکانی خۆی یا ئەم و ئەو یا ئەو خوێندنەوانەی کە بوویەتی و لەبەر رۆشنایی تیۆرە داڕێژراوەکان کە لە جۆر و شێوەی ژیانێکیتر لە دنیایەکی



پێشکەوتووتردا خێزاون بکەوێتە داوەری و ڕەخنە و توێژینەوەی بەرهەم یا بەرهەمەکانی مەنسووری یاقووتی.

هەل و دەرفەتی نووسینیان لە من سەند. هەل و دەرفەتی ژینیان لێ زەوت کردم. تا ئێستاش دەرفەتێ نەڕەخساوە و هەر سەرگەرمی پەنجە نەرم کردنم لەگەڵ گرفتەکانی بێ ژیواری و ئیشیدا.

نەمتوانیوە ساتێ بە ئارامی و ئاسایش و بێ دڵەڕاوکێی ترسی مان و برسیەتی خۆم تەرخانی ئافراندن و بەرهەمێ بکەم وا دیارە بە ئەنقەست و خوازراو بار و دۆخەکەیان وا ئامادە کردووە کە لە پێناو پارووە نانێکدا هەموو کات و ساتم لە دەست بدەم و بکەمە قوربانی. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کۆمەڵە چیرۆکی، «هێڵی سنوور» کە لە بارەی ئەنجام و لێکەوتنەوەکانی شەڕی هەشت ساڵەی ئێران و عیراقەوەیە تەواو بووە و ئەم بەرهەمەم خولقا.

ئێستاش بە خاتری ئەو پارووە نانە ناچارم لە هەفتەنامەیەکی ناوچەییدا کات و سات و ژیانم لە دەست بدەم و بڕوات، ئەویش لە ڕاستیدا بە خاتری هیچ و کەمترین مووچە کە ناکاتە پارەی دوو گوونی برنج، پیشەی ڕۆژنامەوانی پیشەیەکی کوشەندەیە ڕێك وەك ئاش دەمێنێ دەبێ بەردەوام گەنم ئامادە کەیت و بیکەی بە گەلوویدا. تەنیا نیم هاوسەر و کچۆڵەیەکم هەیە کە ئێستا لە پۆلی سێی ناوەندیە هاوسەرەکەم مامۆستا و وەك خۆم لە کار دەرکراوە. ئەویش بوو بە قوربانی شەپۆلی کوێری پاكسازی و لابردن.

کەسانێ دەستیان داوەتە ڕەخنەی کارەکانی من بێ ئەوەی هیچ توێژینەوە و ناسینێکیان لە قۆناغەکانی ژیانی من هەبێت و دەورانی نووسەری من بناسن. بێ ئەوەی سرنجی کۆی بەرهەمەکان بدەن بە پاڵپشتی فرمولە زەینییەکانی خۆیان و ئەو بۆچوونانەی کە

زۆربەیان مستەوردن رەخنەکانیان تەنیا لە پێناو تیژ کردنی ویستی رۆژدا یا ویستی دەسەڵاتدا ئاراستە کردووە.

تەنیا رەخنەیەکی کورت بەڵام تۆکمە رەخنەیەکە کە «تەبەری» لە ژێری ناوی چرایە بە سەر مادیان چیاوە نووسیویەتی. پێش تەواو بوونی ئەو بیۆگرافییە پێویستە کە ئاماژەیەک بدەمە ئەو بەرهەمانەی پاش چەندین جار چاپ و ئەژماری فراوان ئیستا ئیتر نایابن و دەست ناکەون.

١- کۆ ئەفسانەی کوندنشینانی کورد فولکلۆر

٢- نووسراوەکانی مامۆستایەک بیۆگرافی

٣- هەنگاوێ بۆ پێشەوە رەخنەی ئەدەبی

٤- سەرنجێك لە بەرهەمەکانی دەروێشیان رەخنەی ئەدەبی

٥- لە پشت دیواری بەفرەوە ئەدەبی منداڵان و مێرمنداڵان

٦- چیرۆکەکانی کازمئاوا ئەدەبی منداڵان و مێرمنداڵان

٧- شێوەیەك لە ژیان ئەدەبی منداڵان و مێرمنداڵان

٨- منداڵانی کرماشان ئەدەبی منداڵان و مێرمنداڵان

٩- شانامە کوردی «برزوونامە» بلاو نەکراوە

١٠- کۆمەڵە وتار بلاو نەکراوە

بە پێویستی دەزانم بە شێوەیەکی کورت و کۆبەند روانگە و بۆچوونەکانی خۆم دەربڕم.

هەر وەکو پێشتر ئاماژەم کرد باوو باپیری من لە هەر دوو لای دایك و باوکەوە تا قوولترین قوولاییەکانی مێژوو کوردن، ئێمە بە کوردی ئەدوێین، کوردین، بەڵام چون زمانی رەسمی ئێران فارسییە و هەر چەند کوردیش گەلێکە لە گەلانی ئێران بەڵام رێگای کوردی نووسینمان نەبووە و ئەدراوە بۆیە بە زمانی شیرینی فارسی دەنووسم.

راستە زمان کرنگە و کۆڵەکەی شوناسە بەڵام تەنیا پێوەر و پێوانەی شوناسی ئێمە وەك کورد دروست ناکات. ئاوەز و ئەقڵانییەتی ئێمە وەك کورد کە رەنگدانەوەی روانکەی مرۆڤدۆستانە و رێزنانە لە مافی هەموو گەلان و هەموو زمانەکان فاکتەرێکی دیکەی شوناس و شارستانیەتی ئێمەی کوردە. چەوسانەوە و زوڵمێ کە لە کورد کراوە لە درێژەی زەمەن و مێژوودا تەنیا چەوسانەوە و زوڵمی کلتووری نەبووە و نییە و تەنیا چەوسانەوەی نەتەوەییش نییە بەڵکو لەگەڵ خۆی هەڵگری چەوسانەوەی چینایەتی و مێژوویی و... هتد.. بیە.



لە دەورانی دەرەبەکایەتیدا جەماوەری زەحمەتکێشی کورد لە ژێر زوڵم و زۆرداری سەرانی خێڵ و بنەماڵە دەرەبەگەکاندا بوو. ئەمڕۆ جیهان گۆڕاوە و قۆناغ جۆرێکی دیکەیە و بورژوازیەت تاکەسواری گۆڕەپانەکەیە کە خەڵکی بێ بەشی کورد کەوتوونەتە ژێر جزمەی ئاسنینی سەرمایە. وەك نووسەرێکی کورد ئەخوازم ئەم قسە و پەیامە دەربڕم بۆ لاوان و چالاکانی سیاسی کورد کە دەبێ ئێمە دواکانی خۆمان لە چوارچێوەی ئێرانێکی ئازاد و فیدرالدا دەربڕین و پێ لە سەر فیدرالی و پێکەوەبوونی ئاشتی خوازانە و خۆویست داگرین. کورد دەیەوێ پێش کەوێ دەیەوێ ژیانی پڕ ئاشتی و شادی لەگەڵ دیتران هەبێ گەلی کورد گەلێکی مرۆڤدۆستە و هەوڵ ئەدات بە کردەوە رێز لە مافی هەموو گەلان بگرێت و تا ئێستای مێژوویش گرتوویەتی.

پێوەری ئەمڕۆ بۆ هەر کەس و گەلێ بریتیە لە:

رێز گرتن لە مرۆڤ، ئەوین بۆ سروشت، کار و خەبات بۆ پێشکەوتن، هەوڵ بۆ گەشەی کلتوور و شارستانیەت و عەقڵانیەت، رێز گرتن لە واتای زەحمەت و خۆشەویستی مرۆڤەکان بێ هیچ جیاوازییێکی زمانی و نەتەوەیی و ئایینی. سەربەرز بژین.

# پێویستی چیرۆك و جیهانی چیرۆك

ن. مەنسوور یاقووتی
و. جەلیل ئازادبخواز

لە وەسفی زماندا نوام چۆمسکی دەڵێ: «زمان دەنگ و مانا بە شێوە و ڕێکایەك بە یەکەوە دەبەستێتەوە.»

مرۆڤ بە زمانەوە شوناسی پەیدا کردووە و هەر بە زمانیشە کە شوناس بە دەست دێنێ. ئەم واتایە بەو مانا نییە کە بڵێین هەموو شتێك زمانە. هەموو شتێك زمان نییە. زمان کارکردی تایبەتی خۆی هەیە کە دەبێ بیناسێنین.

بابەتی زمان، بابەتێکە ئاڵۆز و درێژەدار. لەم نووسراوەیەدا من هەوڵ ئەدەم کە ڕۆڵ و کاریگەرێتی زمان لە چیرۆك و هۆنراوەدا بخەمە روو.

ڕوانگەیەکی فۆرمالیستی لە ئاستی جیهاندا تێدەکۆشێ کە کاریگەرێتی و ڕۆڵی سەرەکی و بونیادی بداتە زمان و ناڕاستەوخۆ و بە شێوەیەکی ڕازاوەیی و ئاڵۆز واتاکان لە نرخ و بەها خاڵی بکاتەوە و یا بەرەو پەراوێز و کەنار ڕاماڵیان کات و لە بواری شیعر و چیرۆکدا هەر وەك کرمی ساقەخۆر تەنیا پۆستی بەجێ بێڵێت.

لە وڵاتی ئێمەدا لەم چەند دەیەی دواییدا ئەم ڕوانگە فۆرمالیستیە زمانناسانە هەوڵی داوە کە چیرۆك و هۆنراوە لە ناوەرۆکی ژیان بەخش و خوێنی گەرم و جۆشان خاڵی کاتەوە و سارد و وشك ڕایگرێ بە تەواویش سەرکەوتوو بووە و ئەم بۆچوون و ڕوانگەیە پەیوەست بووە بە بۆچوون و ئەندێشەکانی زمانناسی ئوتریشیەوە سوسور.



سەیر کردنی بارودۆخی شیعر بە شێوەیەکی گشتی و شەپۆلەکانی بە تایبەتی چیرۆك بە شێوەیەکی کەمتر کە دەکێشێتە دنیای کایە کەلامیەکانەوە.

و لە ڕەوتی جێگیرکردنیاندا وەك کایەی زمانی ڕوانگەی فۆرمالیستی بۆ زمان وەك دیاردەیەکی ئۆرگانیك و پەیوەست بە بارودۆخی تایبەتی

کۆمەڵایەتییەوە لە ساتەوەختێکی مێژووییدا، لە جیهان ژنێکی هەمواردا توانیویەتی هەندێ فۆرمی ناپەیوەست کەشە بدات کە بە هیچ جۆرێ لە خزمەتی ژیان و چییەتی ژیاندا نین.

ڕەوەندی کەشەکردنی مەغز و کەلوو دەست و پێکانی لە مرۆڤدا لە پرۆسەیەکی زۆر ئالۆز و درێژخایەندا بووەتە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ لە قۆناغی زمانی ئاماژ و ئیشارە تێی پەڕێ و بگاتە زمانی پەیوەندی و بتوانێ بە یارمەتی زمان لەگەڵ مرۆڤەکان و دنیای دەوروبەریدا پەیوەندی بکرێت و واتا زەینەکانی خۆی بەربڵاو و فراوانتر بکات و کەشەیان پێ بدات.

بێ کەشە و پێشکەوتی زمان مرۆڤ هەر وەکو گیانلەبەرانی‌تر تەنیا دەیتوانی لە ڕادە و سنوورێکی زۆر تەسکدا تەنیا بە سەیر کردن و دەست و برۆ جووڵاندن و دەنگ و نەعرە لە کەلوو هێنان پێوەندی بکرێت و بەس.

لەبەر ئەمە کەشە و پێشکەوتی زمان ڕووداوێکی گرنگە لە ژیانی مرۆڤدا.

زمان پردی پەیوەندی نێوان مرۆڤەکانە و هۆکاری گواستنەوەی مانا. لە لێکدانەوەیەکی ورددا زمان ناتوانێ تەنیا دیاردەیەکی دابڕاو موجەڕەد بێت یا وەك دیاردەیەکی بە تەواوی زەینی دابڕاو بجووڵێتەوە و هەڵسوکەوت بکات. چونکە بوونی زمان هەرچەندە لە خۆی پرۆسە و ڕەوتێکی زەینییە، بەڵام بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە عەینیەتی لەدایك دەبێ و دێتە بوون. سروشت، شەمەك، مرۆڤ، لە پێشکەوت و کەشەی زەین و زماندا ڕۆڵی سەرەکی دەبینن.

لەم پەیوەندیە دا دەتوانرێ ئاوڕ لە ژیانی بنەماڵەکان، هۆزەکان بدرێتەوە کە زەخیرەی کەمتری وشە و واژەیان هەیە. وشەکان لە بەستێن و شوێنگەیەکی دیاریکراو جوگرافیای ژیانێکی بەسراودا زۆر کەم و دانسقە دەبن.

زمان لە دنیای شار و شارستانیەتەکاندایە کە ئالۆز و بڵاو دەبێتەوە. هەر وەکو چۆنیەتی کار و پیشەکاریگەری گرنگ و ڕاستەوخۆی لە سەر زمان هەیە و دەبێتە هۆی هەژاری و دەوڵەمەندی زمان. بازنە و دنیای وشەکانی فەیلەسووفی، کۆمەڵناسی، چیرۆکنووسێکی پسپۆڕ و وتارخوێنێکی توانا زۆر بەربڵاوتر و گەورەترن لە دنیای زمان و وشەکانی کەسانێ کە پیشەی سادەیان هەیە.

بۆ هەندێ لە ئەندامانی کۆمەڵ بێ ئەوەی ڕەگەزیان گرنگ بێ، زۆر وشەی پات بووە بەکار دێن و کاتی قسە کردن دوچاری گرفت دەبن و لە قسە کردنەکانیاندا هەمیشە وشەیان پات دەکەنەوە.

هۆکەی ئەمەیە کە جۆری ژیان و کار و پیشەیان زۆر ساکار و سەرەتاییە و هەر ئەو واژانەی کە لە زەینیاندایە بەکاری دێنن و بۆ دەربڕینی مەبەستیان بەسە. زمین هۆی پەیوەندی و دەربڕین و واتا و بوونی مرۆیە و بوونی شاعیرێ یا نووسەرێ لە ڕێگای زەخیرەی وشەکانیەوە دێتە بوون و ئافراندن و هەر لەبەر ئەم زمانە ناتوانێ هۆیە بێ بۆ کایە زمانیەکان، بۆچی؟ چونکە بوونی زمان لەسەر بنەڕەتی پێویستی و زەروورەت دروست بووە و هاتۆتە بوون. زمان ئەرك و بەرپرسایەتیەکی مێژوویی، فەلسەفە، کۆمەڵایەتی، کولتووری و هونەری لە ئەستۆدایە و لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێ و ئەمەش جیاواز لە چۆنیەتی کارکردی ئەو لە پەیوەندی لەگەڵ دروستکردنی ڕێکخستن و پێوەندی و گواستنەوەی واتاکان لە ئاقاری ژیاندا.

بە پێی ڕۆڵ و چییەتی ئەم ئەرکە گەورەیە شاعیر و. چیرۆکنووس دەبێ زەخیرە و بازنەی وشەکانی خۆیان زۆر و بەربڵاو بکەن و بە پێی بەرپرسایەتی مێژوویی زمان ڕۆڵی بەرپرسی خۆیان ببینن.

هەرچەندە بە باشی پەیوەست بە زمانناسی نوام چامسکی واتەنی: ئێمە نازانین و بە پێی ئاوەزی ئێستامان ڕەنگە هەرگیز نەتوانین بزانین کە هوشی ئاسایی مرۆڤ چۆن زمانی وەك ئامرازی بۆ دەربڕینی مەرج و تەکەرەی ئەندێشە و ئیماس بەکار دێنێ.

هەر جۆر بێت و لە هەر گۆشەیەکەوە سەیری زمان بکەین بۆ چیرۆکنووسێ زمان هەر ئەو گرنگیەی هەیە کە ئاو بۆ ماسی و ئۆکسژین بۆ ژیانی گیانلەبەری زیندوو هەیانە.

هەر چەندە کە زخیرەی وشەکانی نووسەرێ زۆرتر دەبێت دەق و بەرهەمەکەی لڤاوی تازەیی و تین و تاو و گەشانەوەیەکی‌تری هەیە.

زمان لە دەست کەل و زەینی نووسەردا سەرەتا وەك یاقووتێکی گەورە و خام و نەتاشراو وایە کە دەبێ کاری لەسەر بکرێت و ئەوەندە بتراشرێت لووس و مشت و ماڵ بکرێت تا دەبێتە شتێکی شیاوی سەرنجی چاوێکی جوانپەرست و پەسەند.

لە ڕێگەی زمانەوەیە کە واتاکان دەردەکەون و دەکوێزرێنەوە. زمانی کاڵ و کەشەنەکردوو ناتوانێ واتا گەورە و شاکارەکانی مرۆڤایەتیەوە ناتوانێ ژیانێکی ئافراندە و ئەبڕاوەی ببێت.

لە جیهانی بوون و لەم کەوشەنە هەستکراوەدا هیچ شتێ لە دەرەوەی سنوورەکانی مانادا نییە. بەڵام ناکرێ واتا گورە و قوڵ و ئەمرەکان بە زمانێکی کاڵ و لاواز و خاو بەرگی ئەمری لەبەر کەن. دیارە هۆشیاری و ئاوەز و ئەندێشەی دەوێ کە نووسەر ئەسیری جریوە و تریفەی وشە فریودەرەکان نەبێت و لە هەر وشەیەك لە جێگا و شوێنی شیاوی خۆیدا سوود وەرگرێ نەك وەك هەندێ لە نووسەرانی ئێمە بکەونە شانۆکاری لە ڕێگای وشەوە و ئەمە بکەنە دەسمایەی شانازی و فەخرفرۆشی هەر وەك تاووسێ کە هەر ساتە و ساتە چەتری پەڕەکانی دەکاتەوە و خۆ دەنوێنێ.

پاککردنەوەی زەین و زمان لە وشە فەلەج و نەخۆش و ناتوانا و مردووەکان، پاککردنەوەی زمان لە وشە نەزۆکەکان نەگونجاوە مەگەر بە دەوڵەمەندکردنی زەخیرە و بازنەی زمان و ڕاهێنانی زەین لەسەر مەشق و گەڕان بە دوای مانا قووڵەکاندا.

## نمونەی چیرۆك

# قەرەنتینە[١]



پۆلیس پاڵی پێوە نا و خستیە ناو قەرەنتینە و دەرگاکەی لە پشت سەریەوە بەست. تاریکی باوەشی بۆ کردەوە و بۆنێکی پیس کیانی هێنایە هەشۆکان. کورتەساتێ برژانگەکانی کەوتنە سەر یەك و چاوی دا بە یەکا. تا توانی عادەت بە لاوازی گڵۆپ و تاریکی دۆخەکە بکات. ڕێگای جوولانەوە نەبوو، ئاپوورەی کەسەکان لێواولێو لێك سمڕابوون دەرزی نەدەکێشا. شوێن بۆ راکشان نەبوو. زۆربەی زۆریسان بە پێوە وەستابوون. ئەوانەی کە دانیشتبوون دیواری سارد و سڕ پاڵپشتیان بوو کەسانی خاوەن پیشە بوون (سابقەدارەکان بوون) کۆنەکار بوون. کەسانێ کە دە ساڵ یا زۆرتر ناوناوە ڕێگایان دەکەوتە قەرەنتینە و قەرەنتینە ماڵی دووەمیان بوو. ئەبوو ئەوانەی کە تازە دەهاتن لەسەر پێ راوەستن، لەسەر پێ بخەون، لەسەر پێوە پشوویان نەدا. تەوانەشی کە بۆ جاری دووەم و سێیەم و ڕێیان دەکەوتە قەرەنتینەوە هەر حسابی تازەهاتوویان بۆ دەکرا و دەبوایە یاساوڕێسا دامەزراوەکانی کۆنەکاران رەچاو بکەن و نۆرمی (شەکەتەکان) (سینەسووتاوەکان) ئەوانەی کە بە پیشە تاوانکارن و تاوان بووەتە پشەیان قبووڵ و تەحەممول بکەن.

ئەگەر کەسێکی تازەهاتوو دەچووە ئەوێ و ناشارەزا بە ڕێکخراو و یاساوڕێسای دانیشتووانی دێرین و هەمیشەیی قەرەنتینە هەڵەیەکی چووکەی دەکرد و مەبەستی دانیشتن بوو، تا بۆ چەند

---

١ ئەو چیرۆکانەی ناوی وەرگێڕیان لەسەر نییە، لە وەرگێڕانی بەڕێز (جەلیلی ئازادیخواز)ن لەبەر لایەنی هونەری دوبارەکردنەوەی ناوەکەیمان بە پێویست نەزانی.

چرکەساتێك ماندوویەتی دەرکات، ئەژنۆکانی بحەوێنەوە، بۆکسێکی توند و بەهێز ئەیدا لە لووتی، ئەژنۆیەك توند ئەدرا لە قەفەسەی سنگی و هەناسەی تەنگ دەکرد. لە شوێنێکی نادیارەوە بە چەقۆ و تیزبڕ خەتێکی بە دەموچاویا دەکێشا و بۆ هەمیشە ڕواڵەتیان عەیببار دەکرد. ئەگەر هاواری دەکرد دەری دەمیان دەبەست و هاواریان لە گەروویدا دەشکاند. هەرچەندە ئەگەر هاواریشی بکردایە کوێبیستێ نەبوو کە بێت و یارمەتی بدا. کاربەدەستان و پۆلیسەکان دەیانزانی کە تازەهاتوویەکی ناناشنا بە یاساوڕێسای قەرەنتینە ئەو نۆرمەی شکاندووە و خەریکە سزا ئەدرێ. ئەگەر دەشهاتن و دەیانپرسیەوە دەبوایە یەخەی کێ بگرن؟ ئەوەی کە شکایەتی کردبوو خۆی نەیدەزانی کێ بەرچاوی شین کردوەتەوە یا بە چەقو و تیزبڕ بۆ پەندی دیتران ڕواڵەتی عەیببار کردووە.

ئەگەر کێشەکە گەورە دەبووەوە کاربەدەستان دەستیان تێ دەخست و کەسێکی ناناشنا و سادە و ساکار و دوور لە نەزم و یاسای ئەوێ شەهادەتی ئەدا و دەسوەشێنی دەناساند، ڕۆژگاری ڕەش دەبوو. لەناو بلووکی بەنددا دەستە نادیارەکان ئارامی و ئارامشیان لێ زەوت دەکرد. کتریە ئاوی گەرمیان ئەدایە دەست تاوانبارکراوێکی شێت و لە ڕاڕەوەکەدا کتریە ئاوەکەی بە ڕوویا



هەڵدەپاشی و دەموچاوی بارانی ئاوی گەرم دایدەگرت یا لە خەودا دەیان کەس خۆیان ئەدا بە سەریا و دەمیان دەبەست و بێ ئابڕوویان دەکرد.

هەندێ جار کۆنەکارەکانیش خۆیان مەجبوور بوون کە بارودۆخی نالەبار و جەهەنەدەمی قەرەنتینە قەبووڵ بکەن. کاتێ کە ئوکسژین کەم دەبۆوە جێگا نەبوو بۆ دانیشتن، دەبوایە چەندین هەفتە بە سەر پێوە بخەون و وەك دەرزی باریك بن و تەنیا پێست و ئێسقانێکیان لێ بمێنێتەوە. موعتادەکان کە زۆربەیان موعتادی «هرۆئین» بوون، دەبوایە خۆیان لە بەر دەم ئازار و دەرد و کەسەرێکی لەتوانابەدەر و گیانهەژێنەر و رووخێنەر راگرتایە. رشانەوە، دەردی ئێسقان و بێخەوی و فێ و کەفچەرانی مەرگناسا و ئازارێ کە لە هەزار لاوە پێستیانی خاڵخاڵ و تیژ دەکرد، شوێنی هاوار و ناڵینیش نەبوو. دەبوایە خۆ لەبەر ئازار و کەسەر راگری و بیرێژێتە خۆتەوە و دەم نەکەیتەوە وەگەرنە کوا تاقەت و توانای لێشاوی توانج و تانە و سووکایەتی؟!

توانجە بەچز و پڕ ئێشەکان گیانیان دەسمی و وێرانیان دەکرد و



وەك ژار خوێنییان ژاراوی دەکرد.

یۆنس هەموو ئەمانەی دەزانی و ئەزموونی کردبوون و هەمیشەیش ناچار بوو کە لە دالآنی ئەم دۆزەخەدا بە خۆڕاکری و وەستان خۆی راگرێ و لەم بگرەوبەردە تێپەڕێ. یۆنس یاخیبوون و هەڵچوون لە چوارچێوەی قەرەنتینە و قەرەنتینە کۆتابلۆیەکی ناشیرین و پڕترس و لێواولێو لە سووکایەتی لە زەینیدابوو. ئەوە بوو کە کاتێ پای خستە دنیای قەرەنتینەوە بۆنی پیس و دڵتێکدەر رژایە لووتی و پەرەکانی لووتی لەرانەوە و کەوتنە جوولە. هەوڵی دا کە چاوەکانی بە دۆخەکە خوو بگرن و رابێن. جاری یەکەم نەبوو کە سەری لەوێوە دەردەهانی. خووی گرتبوو بە ژیانی ناو قەرەنتینە. دەیزانی کە چۆن خۆی لەگەڵ دۆخ و دەوروبەر رێك خات. هەرچەندە کە زیاتر لە ٢٣ ساڵی نەبوو، بەڵام ژیان لە کوورەی سووتێنەری قەرەنتینەدا وا پاك و پاڵووتەی کردبوو، وای برژاندبوو، دەیزانی کە دەبێ سەرەتا ناشنایە بدۆزێتەوە لە کاتی تەنگانە و گرفت بە یارمەتییەوە بێت و پاشان تازەهاتووێ بدۆزێتەوە و بە زللە توند بکیششێ بە بناگوێیا و خۆی شوێنەکەی داگیرکا.

کە دەرگای قەرەنتینە لە پشت سەریەوە بەسترا، موعتادەکان ئەوانەی کە موعتادی هرۆئین بوون بەرەو لای ورووژان و روویان لێ نا... دەیان دەست لە هەموو لایەك کەوتنە گەڕان و دۆزینی باخەڵە دڕاو و پینەپینەکانی. هەر کەسە و شتێکی دەوت.

- چیت هانیوە؟ لە کوێ شاردووتەوە؟ خوماری کوشتمی بە خوا!

- پاوپێلاوت سەرچاو، فریشتەی یەکچاو!

- خستوویەتە ناو گۆرەویەکانی.

گۆرەویەکانیان لە پێی دەرهانی و تەنانەت درزەکانیشی گەڕان و بێ هیوا فڕێیان دان بە ئاسماندا. دەیان دەستی لەرزۆك خەریکی گەڕانی جەستەی بوون.

- دە بڵێ، دەی بڵێ لە کوێت شاردۆتەوە؟ مردم بە خوا.

- بۆ ئازارمان دەدەی؟ بە قوربانی ئەو یەکچاوەت بم کە وەك کەڵەشێرە.

- ئەگەر لە ناو شۆرتەکەت دایە خۆت دەری بێنە، مردین لە خوماری.

دەستێ خۆی خزاندە ناو شۆرتەکەیەوە و یۆنس بۆکسێکی سراواندە سەروچاوی موعتادەکە، موعتادەکە دەستی هێنایە دەرەوە و تلاوتل کەوت بەسەر دیتراندا و بە ناڵە وتی:

- ئاخر بۆ لێم ئەدەی سەگڕەفتار؟ من کە کارم بەسەرتەوە نییە؟

یۆنس هاواری کرد:

- من گەرتی نیم.

موعتادێ کە سەروقژی ئاڵۆزاو و ناڵەبار بوو، هەیکەل و ئەندامی چەماوە بوو، بە گاڵتەجارەوە وتی:

- هەر ئەوەیە کە شێوە و رواڵەتت لە مرۆڤ ناچێ!

ئەویدی کە ددانی لە دەمدا نەمابوو:

- خەمت نەبێ، ئەتهێنینە ریزی خۆمانەوە.

- درۆ ئەکا لە سکیا شاردویەتیەوە، بڕۆ ئاودەست، بیدە دەرەوە خێرت دەکا.

- راستدەکا ئابرا... بڕۆ دەی بڕۆ. لە رووت نایە لەوێ دانیشی چاومان نەبەستین، ئەگەر بایەکیش دەرچێ، خۆمان ئەکەین بە کەڕ و کوێر.

- دەی بۆ وەستاوی؟

وەری دەچەرخێنن، دەبڕۆ دەی، بڕۆ دە خۆش کە دەی، ئاودەست لە گۆشەی ژوورەکەدا بوو، ئەدەرگای بو نە پەردە بەدەوریدا گەڕابووەوە، هەر تازەهاتوویێ کە لە سەری دادەنیشت، دەیان موعتاد گەمارۆیان دەدا و چاویان دەبریە قوونی رووتی، کە کەی بەستەکانی مادە بێتە دەرەوە و ئەوان چلێسانە بیانرفێنن و لە پێناویاندا شەڕ و تێکهەڵچوونی خوێناوی دەست پێ بکات.

موعتادێ کە ریشی درێژ و زەرد و چاوگەلی گەورە بوو، یەخەی یۆنسی گرت و ناڵانی:

- مردم، بە نۆکەرت بم مردم! لە کوێ شاردووتەتەوە؟ بەستەی هەزار تمەن دەیکڕم. لە بەند و بلوکدا پارەکەییت ئەدەمێ. یۆنس دووپاتی کردەوە:

- وتم کە من گەرتی نیم.

- کارت کڕین و فرۆشتن بوو؟ وایە؟ ئەگەر ئەتوانی بڵێ نا!

- پارەم لە کوێ بوو خەریکی کڕین و فرۆشتن بم؟

- ئەی بۆچی هاتووی بۆ ئێرە دایك...

- توند مشتی یۆنس دای بە ژێر چاویدا و کەوت بەسەر خەڵکەکەدا. هەڵگەڕایەوە و بە ئانشکی دای بە سکی ئەوی تردا کە لە پشت سەریەوە وەستابوو. یەکێ گازی لە پێی گرت. زایەڵە لە قەرەنتینە هەستا و بوو بە غەڵبەغەڵب و دەنگەدەنگ.

- بابە لێی گەڕێن هاوشاری خۆمانە.

- چ هێز و زۆرێکی هەیە چاو کەڵەشێر.

- کورە ئەمە یۆنسی خۆمانە، جێی بۆ بکەنەوە خوێڕینە.

چەند بستێ جێگای بۆ کرایەوە کە بتوانێ بە راحەتی بە سەر پێوە بوەستێ. هەوای پیس و بۆگەنی هەڵمژی و رەوانەی سیەکانی کرد. هەستی کرد جەستەی گەرم داهاتووە.

سەفەری هاوکۆڵانی خۆی پێ گەیاند و وتی:

- جگەرە و مگەرەت پێ نییە؟ کەی هاتووی؟

یۆنس بە تەنیا چاوەکەی سەیری کرد و وتی:

- نە سێ ڕۆژە بێ جگەرەم.

دەنگێ لە پشتەوە پرسی:

- کەسێکت کوشتووە؟

- نە .

- دەی چیت کردووە؟ چ کارێك؟

ئەسغەر توورە بوو. یۆنس کۆنەکارە و سابقەی هەیە. سەر مەنێنە سەری، منالی قەرەنتینەیە.

موعتادێ بە وڕی و بێ حەوسەڵەییەوە پرسی:

تو خوا بڵێ، چیت کردووە؟

یۆنس چاوی بڕیە هەواکێشەکە و وتی:

- دزی.

* * *

دایکی یۆنس ئاوڵەڕوو لەچك بەسەر و پینە پۆش، بە سەریا قیژاندی:

- باوکە بێ غیرەتەکەت کە ڕۆژی دانەیە یەك تەنی کاسب نییە و سێ خوشکی کەڕ و لاڵیشت هەیە کە خوا زەمینگیری کردوون تا بڕۆن پاروە نانێ دەربێنن و بیخۆن.

تۆش بەم بێ غیرەتییە هەر لە خۆی دەچێ و شەو و ڕۆژ بە کۆڵان و شەقاماندا دەگەڕێی و بە دەستی خاڵی دێیتەوە ماڵەوە.

- چی بکەم؟ بڕۆم دزی بکەم؟

- ئەگەر پیاو بواییەی ئەچووی بۆ دزی، پێشتر و زەمانی زوو لە تایفەدا هەر کەس و لاوێ کە ئەسپ و چەکی باشی نەبوایە و دزی نەکردایە، ژنیان نەئەدایە. کوڕی چاك ئەچێتە دزی.

بەڵام ئەو نە ئەسپی بوو نە چەك. لە منداڵیدا بە هۆی بەردەفڕکێی هاوساڵ و هاوکایەکانیەوە چاوێکی لە دەست دابوو. لەبەر تانە و گاڵتە و سووکایەتی مامۆستا و هاوقوتابییەکانی وازی لە خوێندن هێنابوو. ئێستاش دایکی خەریکە سەرکۆنەی دەکات و توانجی لێ ئەدات.

دوو ڕۆژە نە نانی نیوەڕۆمان خواردووە و نە شێومان کردووە. ئەی تف لە غیرەتی خۆت و ئەو باوکە خوێڕی و چەورەیەت. بڕۆ



دەرەوە لەم ماڵە برۆ دەرەوە، برۆ کارێ بکە.

- کار نییە... نییە!
- بۆ بۆ هەموو کەس هەیە و بۆ تۆ نییە؟
- ئەوان پارە و ئاشنا و واسیتەیان هەیە. من چی؟ من هیچم نییە هیچ!
- لەش و بازوو و دەستی ساغت هەیە و دوو پێ بۆ رۆشتن.
- دەست و پێ نابنە پارە و ئاشنا و واسیتە.
- دزیش نازانی ئەی خاك بەسەرت! دزیش نازانی؟ برۆ دزی بکە...

***

دوو شەوانە رۆژ بوو کە بستە جێگایەکی دەست نەکەوتبوو کە بخەوێ. دوو شەوانە رۆژ کە ماندوو و هیلاك بەسەر پێوە وەستابوو و هەوای پیسی قەرەنتینەی رەوانەی سیەکانی دەکرد. خۆشترین و حەمام دەسکەوتێ بوو.

- وەرنە دەرەوە خێرا!

نە سابوون و نە شامپۆ و نە لفکە و نەخاولی. هیچ هیچ شتێ. دەمپاییش هەم نەبوو، نەبوو کە لە پێی کا. وەکو دیتران پینەپۆش و پێخاوس، گۆناکانی کەوتبوونە چاڵی و زمان و لێوی وشك و وڕ و گێژ پێی خستە حەوشەکەوە. بۆ چەند چرکەش بێ دەسکەوت و چەپاوێ بوو کە لە قەرەنتینەوە ئەهاتە دەرەوە.

لە دەرەوە هەتاوی هاوین و چۆلەکە بەجریوەکان لە لابەلای چڵ و لق و پۆی سەوزی درەختەکانەوە و پشیلەیەکی قەڵەو بە چاوانی سەوز و شەفافەوە لە نزار و سێبەری دیواردا خۆی مات دابوو. بەسەر قوللەی بورجی بەرزەوە یاساولێکی خەپە لە هاتوچۆدا.

- راکەن حەمام تەنیا پێنج خولکەیە... رابە مردەشۆربردوو.

دەسکەوتێ بوو لە هەوای ئازاددا پێخاوس بەسەر قیتاوی گەرما راکردن.

- بە چی حەمام کەین؟
- راکەن ئاوەکەش بۆ نیوە زیادەیە. لە گڵەجانەدا چ دەکەن؟ راکە.
- برسیمە، برسیمە پارەوە نانێکی وشکم دەسکەوتووە.

***

کاتێ کە هاتە حەوشەکەوە ئیتر تەپلی شەڕ لە لێدان کەوتبوو، دایکی بە لێوی قڵیشاو و خوێنڕێژانەوە دندانە شکاوەکەی نابووە لپی دەستی و سەیری دەکرد.

کۆگایەك لە مووە رەشەکانی سەری ئالابوونە چڵ و پۆی نیلووفەرە شینەکەی حەوشە. نینۆکەکانی دایکی، رواڵەت و دەموچاوی باوکی رنیو و خوێناوی کردبوو، وەك ئەوەی پشیلەیەك چنگوڵی لێ کرتبێت و ئەو رواڵەتە زەرد و بێ رەنگەی خوێناوی کردووە.

کراسی کۆنە و داتەکاوی باوکی لەسەرە تا خوارەوە دڕابوو. بە شوێن دۆزینەوەی قژپچەکانیدا ناو حەوشەکە دەگەڕا. خوشکەکانی ترساو و چاو دەرپەڕیو قژ پەرێشان بە جلوبەرگی کۆنە و پینە و دڕاو و رواڵەتی زەرد و لاوازەوە لە گۆشەیەکدا دەلەرزین و هەندێ دەنگی فامنەکراویان ئەدایە دەرەوە کە لە خرخری گیاندارێکی سەربڕاو دەچوون.

سفرەی خاڵی نان لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا فڕێدرابوو، گۆزەی شکاوی ئاو لە پاڵیدا لەتلەت کەوتبوو.

***

پاش هەفتەیەك توانی جێگایەك بە ئەندازەی لەپی دەستێ پەیدا بکات و چەماوە تیایدا بخەوێ. لەم ماوەیەدا توابووەوە، ئێستا ئیتر هێرشی ئەسپێکان کە هەر یەکەیان بە قەد مێروولەیەکی گەورە دەبوون، خەویان لە چاوەکانی دەفڕاند.

سەوزەعەلی سەدەمین ئەسپێی گرت و نایە ناو دەورییەك و هاواری کرد:

- چرکەیەك بە بێدەنگی سەیری نمایشی من کەن.

دەورییە پڕ لە ئەسپێکەی هەڵدا بە هەوادا، ئەسپێ بە سەر و گوێی دانیشتووانی قەرەنتینەدا باری. هاوار و هەرای هەمووان بەرز بووەوە.

- ئەی تف لە شانۆ و نمایشت عەنتەر.
- لە گوندیشدا هەر خەریکی ئەسپێ بازی بوویت؟
- بە سواری ئەسپێ هاتووە بۆ سەفەر چیتان لێی دەوێ؟
- یۆنس! تا پەنجەکانیان نەبڕیوی بۆکسێ بکێشە بە دەمی ئەم سپێونەدا.

یۆنس دەوریەکەی هەڵگرت و دای بە سەری سپێون دا و جوێنێکی ناشیرینی پێ دا.

سەوزەعەلی هاواری کرد:

- بابە بۆ لێم ئەدەی؟ ویستم پێکەنن و تاوێ خۆش بن.

یۆنس رێگایەکی کردەوە و خۆی گەیاندە پشت دەرگاکە و لە پشت کونی دەرگای قەرەنتینەوە چاوی بڕیە دەرگا گەورە و خۆڵەمێشیە ئاسنینەکە.

کاتێ کە لە دەرگای ئاسنی گەورەی خۆڵەمێشی هاتە دەرەوە، دەستە بێ پەنجەکانی لەناو گیرفانە دڕاو و پینەکراوەکانیدا شاردەوە و مەکۆی سەرنجی بەخشیە باڵندەیەکی خۆڵەمێشی کە باڵەکانی نەمابوون و بە سینەخزێ بەرەو گڵەجانە دەچوون.

# گورگ

سەری کێژ نەبوو. زۆر بە دژواری هەناسەی ئەکێشا. لەگەڵ رژانی خوێندا شتێ لە سنگ و شانەکانی دەچووە دەرەوە. شتێك لە بوونیا نەنیشتە بن، بنـنشین دەبوو. هەستی نەکرد کە ئیتر چاوەکانی وەك دوو ئەستێرەی رۆشن لە شەوی تاریکی زەمەندا نادرەوشێنەوە. تاوناتاوێ پەردەیەکی ناسك بەسەر چاوەکانیدا دەهاتە خوارەوە و پاشان دەکشایەوە. شڵەژانێکی بە کەسەر کە نەیدەویست باوەڕی بکات کەوتبووە بوونیەوە. هەناسەکانی تێك دەچوون، بە ئەستەم ڕێگایان دەکردەوە. ماندوویەتی، ماندوویەتیەکی کوشندە و پڕهێز لە ماسوولکە توکمە و بەهێزەکانیدا هێلانەی دەکرد. چەند کاژێر رایکردبوو. نا، بەڵکوساڵەها بوو چەندین سەدە بوو، رای دەکرد و دەشت و تەپۆڵکە و هێڵی پێچاوپیچی جادە تەنگ و باریکەکان و بەردەڵان و هەوراز و نشێوی سروشتی دەخستە پشت سەر و ئاهەنگی پەنجە بەهێزەکانی بە سەر زەوینەوە ترس و هەراس و تۆقانی دەچری.



وەستا

خێرا سەرنجی دەوروبەری خۆی دا و لەناو درزێکەوە خزایە ژێر زەناریێ، پۆزەی خوێناوی خۆی نایە سەر دەستەکانی و چاوی بڕیە بوونی کە بە شێوەی گوریسە خوێنێک هێدی هێدی لە جەستەیەوە دادەچکا.

پۆزەی روو بە ئاسمانی ساو و ئاوی کرت. خۆر زەرد هەلگەڕا بوو. نالەیەك لە نێو دندانەکانیەوە کشایە دەر، نا، بێ گومان دوای کەوتبوون بەلام رەدیان ون کردبوو، ئیتر بە دوایدا نەدەچوون، لێی نەدەکەڕان.

بەربەری بەیان بوو. قەراغە شیرڕەنگەکانی ئاسمان مژدەی هەلهاتنی سپێدەیان دەدا. شەماڵێ کە لە مێوستانی ئاغاوە تێدەپەڕی بۆیەکی تایبەتی لەگەڵ خۆی دەهانی کە باش دەیناسی.

لە سەر کۆگا خوڵێ، لە پشت درەختی هەڵووژە زەردەوە دانیشت و سەرنجی پەڵە خوێنەکانی یەکێ لە بێچووەکانی تەدا کە دوێنێ لە بن دەوەنێکا رژابوو. دندانەکانی لێك ساوی.

چەند ساڵ پێش بوو؟

نەیدەزانی!

کە خەریك بوو هەر لەم مێوستانەدا گیانی لە دەست بدا، بەلام لە باشی رێکەوت گوللە تەنیا سمتی تولداخ کرد و چاك بووەوە. بەسەر تەپۆلکەی ناو باخە رەزەکەوە قەلای خان ترسێنەر و بە روالەت بالای هەلکشابوو. نیگای کە پڕ بو لە تۆلە و تووڕەیی لە قەلا و لەکە خوێنەکان گوێزایەوە و درێژەی دایە بەرەو پێشچوونی. سەگەکانی پارێزەری قەلا ئەوەڕین و دیار نەبوون. ئەو و سەگەکان ئێستا ئیتر ئەو ئاشنا دێرینانە نەبوون، رەگەز و رەچەلەکی ئە، هەرگیز لەبەر خاتری پاروە نانێ خۆی نەدابووە دەست سووکایەتی ماستاو و کلکەسووتێ. نەچووبووە ژێر کۆتی پەستیەوە، لەو کاتەوە کە سەگەکان ببوونە قەلانشین، ناتەباییەکی توند و دژوار کە ئاشتی نەدەناسی، کەوتبووە نێوانیانەوە.

بە پارێزەوە لە لابەلای چەپەر و پەرژینەکانەوە رێگایەکی کردەوە و چووە باخەکەوە. خشەخشێ بووە هۆی ئەوەی لەسەر جێگای خۆی راوەستێ. پەردەکانی لووتی کەوتنە لەرزین و چالاکی. هاواری فیشەکێ جەستەی جوولاندەوە و بەرزی کردەوە و دای بە زویدا. درەنگ کەوتە خۆی، پاسەوانانی قەلا بوسەیان بۆ گرتبوو، ئەو نەیدەزانی، گازی کرت لە زامەکەی و زووزەیەکی کێشا.

٭ ٭ ٭

رژان و چکانی خوێنی کەم ببووەوە. چاوەکانی لێڵ دەبوون و بەرچاوی رەش دەبوو. شتێکی نادیار ئاناشنا لە بونی ئەو رەشیەدا دەکەڕا و دەیسووتاند و وێرانی دەکزد و لێکی هەلدەتەکاند.

بە چ زۆرێ پەرژینی خراپ کردبوو، هەلهاتبوو، بەلام دیسان ئەگەر ئەو پەرژینە نەدەبوو و ماتلی نەدەکرد، نەیدەتوانی بکوژەکەی بناسێ کە بە سکێکی گەورە و هەیکەلێکی بەرزی نارێکەوە هاواری هەڕەشەی بەرز کردبووەوە. ئەم تابلۆیە لە زەینیدا رەنگی دەکرت و بەرجەستە دەبووەوە. «بەفر هەموو شوێنێکی سپی کردبوو، پەنجە بەهێزەکانی سنگی دەشتی خالنیشان دەکرد و دندانەکانی لە تاو تووڕەیی ،ریقەیەکی خوێنخوازانەیان لێ دەڕژا. هەستی بە سەرما نەدەکرد، باربنی بەفری فام نەدەکرد، تەنیا ئارەزووی لە بڕان نەهاتووی خوێنخۆری لە دلیدا داگیرساندبوو، نا، هەلەی نەدەکرد، خۆی بوو. هەر بەو سکە گەورە و ناشیرین و دەمەکراوە و هاوارە توند و چاوەدەرپەڕیوانەوە پێویستی بە بۆسە نەبوو.»

دەیتوانی بۆ کوێ هەلبێت و روو لە کوێ بکات؟

گەردنی، شارەگی گەردنی. دندانەکانی رێك لەو شوێنە گیر بوون کە دەیویست. چ خوێنێکی گەرم و شیرین بوو!!

هاوارەکانی کە لە بێ هیوایی و بێئومێدیەوە بەرز ببوونەوە و دەزرانەوە. دۆخی چاوانی زەق و بێچارەی چەندە لەززەتیان دەبەخشیە ئەو.

گورگ نیگای بەخشیە ئاسمان و پاشماوەی خۆری پاییزی و ئەو چیا بەرزە خۆلەمێشیە تەمپۆشە.

٭ ٭ ٭



بیری لە جووت و بێچووەکانی دەکردەوە، ئەگەر بە هەڵە ناقارەکەی نەدەگرتە بەر و نەدەهات، لێرەوە تا لانەکەی ڕێگایەکی دوور نەبوو، ئێستاش مەودایەکی شیاوی سەرنج و رامان نییە، بەڵام بێ توانا و لاواز بوو، زامدار و پێکراو بوو، بۆ تۆماری ژیان و بوونیان بەست؟

ئاه... چ پرسێکی بێهوودە!

دەبوا خۆی بگەیێنێتە جووت و بێچووەکانی، ئەگەر لێرە دەمایەوە نادیار ون دەبوو، جووت و بێچووەکانی ئاگاداری چارەنووسی تاڵی نەدەبوون، دەبوایە خۆی نیشانی ئەوان بدایە، مردن لەم ئەشکەوتە چکۆلە و بەردینەدا مردنێکی مەزن و بەشکۆ نەبوو، گلێنە و پزیسکەیەی لێ نەدەکەوتەوە. دڵێکی پڕ لە تۆڵە و نفرەتی تووڕەیی نەدەکرد، ڕەگەزی سەرگەردانی ئەو، دەرکراو و برسی، هیچ کات لە ژێر گاشەبەردێکی تاریک و تەریکدا چاوەڕوانی مردنی نەکردووە، هەمیشە وەڵامیان بە گوللە داونەتەوە.

گورگ جووڵەیەکی دایە خۆی و لە ژێر زەنارەکە هاتە دەرەوە. دەبوایە بچوایەتە پشتەوە و لە داوێنی چیایەکەوە کە ژیانی بە سەر بەردە سارد و قاوەییەکانییەوە زەنگۆڵ زەنگۆڵ چکەی دەهات و دەرژا هەڵکشایە. چەند هەنگاوێ چووە پێشەوە و وەستا، دڵی بە توندی لێئەدا. چەندە توند و خێرا هەناسەی هەڵئەکێشا. دەبوایە بگەیشتایەتە دەرەیەك کە تەمێکی خۆڵەمێشی ئابلۆقەی داوە. لەوێ جووت و بێچووەکانی لە شوێنێکدا کە لە چاوان نادیار بوون، دەژیان. ژیانی هەمیشە تێکەڵەیەکی سەیر بوو لە زام و سەرگەردانی و برسیەتی و بزاوتن. جگە ئەمە دەیتوانی چیتر بێ؟

دانیشت، سەری روو بە ئاسمان و خۆر بەرز کردەوە، زووزەیە کە تێکەڵەیەك بوو لە ئازار و ڕەنج و کەسەر لە گەلووی تاوگرتووی تینوویەوە بەرز بووەوە و دەرەی داپۆشی.

* * *

گورگ مەرگی خۆی بە چاو ئەبینی و دڵتەنگ نەبو، ئەیزانی کە بێچووەکانی، جووتەکەی، لە چیا بەرەوخوار دەبنەوە و خوێنی بە زمان دەلێسنەوە و زووزە دەکێشن. کۆزووزەیەك کە بۆنی نەفرەت و تووڕەیی و تۆڵە و خوێن ئەدەن و دەکەونە دەشت. تووڕە و تۆڵەخواز دەکەونە دەشت تا خەوی شوانان و پاسەوانان بزڕێنن و یادی گورگی گەورە بەرز و مەزن ڕاگرن.

# پشت کۆم

دەتگوت سوسکێکی کرنتارە لە شەش پالۆویەکی بەسراودا. شەش پالۆویە کە چرایەکی پیادا هەلۆاسراوە و باریکە تیرێژێ کە لابەلای دەرابە ئاسنینەکەوە خۆ دەنووێنێ. ئەو وەك سوسکێکی لاواز و کرنتار کە سەروخواری شەش پالۆکەی تەی دەکرد و بەبیر هێنانەوەی یادەوەریەکانی رابردووی بەرەو شەڕی تەنیایی و پالەپەستۆ توند و شکێنەرە دەردکی و ناوەکیەکان دەچوو. هیچکەس لە مالەوە نەبوو، هەموو چووبوون بۆ میوانی. تووتکەسەکێ بە پەنجەی سپییەوە، بە مووی خەنەیی و چاوکەلی ڕەش و وریشەییەوە لە کۆلانێکەوە سەری دەرهانی و چاوی بەو کەوت و دەستی کرد بە کلکەسووتێ بۆی. بە راکردن ڕۆشت و لە تەنەکەی زبلەکە دوو قاچە مریشکی بۆ دەرهانی و خێرا کەڕایەوە. نیکەران بوو تا دێتەوە سەکەکە نەڕۆشتبێ. تووتکە بە چاوانی میهرەبان و پڕ بەزەییەوە سەیری دەکرد و کلکی بۆ دەجوولانەوە، دوو دانە لە قاچە مریشکەکان کە چەور و گۆشتاوی بوون خستیە بەر سەکەکە، سەکەکە یەکێکیانی لە هەوادا کرتەوە و لە ژێر دندانەکانیدا وردی کرد و خواردی. ئەویتریانی لە چاوترووکانێکدا خوارد و ڕەوانەی سکی کرد. بە نیکایەکی پڕسپاسەوە سەیری کرد و کەوتە کلکەلەقە. نێسقانەکانی دیکەی فڕێدایە ڕاڕەوەکەوە کە تاریك بوو، و بەرەو حەوشەکە دەچوو. سەکە هەنگاوێکی نایە پێشەوە و چاوی بڕیە ئەو.

- بڕۆ... بیخۆ نافەرین.

سەکە بە پارێزەوە چووە حەوشەکە و نێسقانەکەی هەلگرت، بەلام پێش ئەوەی بتوانێ کە بکەڕێتەوە بە خێرایی و چابوکی دەرکاکەی لە سەکە بەست.

سەرنجی سەکە پڕ بوو لە ترس، نێسقانەکەی لە دەم کەوتە خوارەوە.

بە خێرایی کەڕایەوە لە هەنبارەکە دەستەپاچێکی دەرهانی و چووە وێژەی سەکەکە.

سەکی پەنجەسپی و مووخەنەیی چاوی بڕیە ئەو دەستەپاچە و سەرنجی پڕ بوو لە ترس و دلەڕاوکێ.

دەستەپاچەکەی لە هەوادا بەرز کردەوە و بە هەموو هێزی خۆی دای لە کەمەری سەکە.



سەکە لە ئازاردا ناڵاندی و بەرەو حەوشەکە هەڵهات. کەوتە دوای. حەوشەکە بچووك بوو. حەوزێك لە ناوەڕاستیدا بوو لەگەڵ ڕەزێکی کۆنەساڵ کە لە گۆشەیەکەوە بەرەو سەر هەڵکشابوو. هاڵە و بەرسیلەی دەرکردبوو. سەرنجی سەکە بە بیچارەیەوە دەوروبەری خۆی دایە بەر نەزەر، چرکە ساتێ بە سەر قادرمەکان کە بەرەو سەرەوە دەچوو ڕاوەستا. دەستەپاچ وەبەر شانی سەکە کەوت.

ناڵەیەکی لە جەرکەوە کێشا و لە قادرمە کلێنەکان چووە سەردوە.

قادرمەکان بە پەستوویە کۆتاییان دەهات. سەکە ترساو و بێدەرەتان چواردەوری خۆی لێك نەدایەوە. کەوتبووە داوەوە. بە زەبوونی و پاڕانەوە سەرنجی بڕیبووە ئەو و دەستەپاچەکەی دەستی.

دەستەپاچەکە دیسان بەرز بووەوە، سەگ بە هەڕەشە دندانەکیڕەی کرد. دار دای لە سەر پەنجەی سەکە، سەکە هێرشی کرد، دارە بە سەریا درا. سەکە ناڵاندی و کریا و هاواری کرد و چنکی لە دیوارەکان گیر کرد.

دەستەی پاچ دەهاتە خوارەوە بەسەر پشت و دەست و چاو و لووت و وێزەی دا، سەکە ئیتر نەیناڵاند، لە گۆشەیەکدا کزی کرد. هەموو جەستەی دەلەرزی و چاوە ڕەشەکانی پڕ ببوون لە فرمێسك.

- برۆ دەرەوە.

سەکە نەدەجووڵایەوە و دەلەرزی.

- بجووڵێ.

سەکە لە جێکەی خۆی نەدەبزووت و بە سەرنجێکی فرمێسکاوی و ماتەوە سەیری ئەوی دەکرد. دانەیەکی دیکەی وەشاند. سەگە نەیناڵاند و دندانی نیشان نەدا و کلکیشی نەلەقاندەوە. دەستەپاچەکەی فڕێ دایە گۆشەیەکەوە. تەنافێکی هێنا و هەڵقەی کرد و کردیە ملی سەکەکە و کێشای، کێشای تا سەکەکەی بردە دەم دەرگای دەرەوە، تەڕ و تلیس ببوو لە نارەقدا. تەنافەکەی کردەوە.

- برۆ.

سەگ سەیرێکی کۆڵانەی کرد، بەڵام هێشتا و هەر سووك و ترۆکراو و هەتك بەسەرداهاتوو سەری خوار و لەسەر دەست بوو. ئیتر نەدەلەرزی، بەڵام نەشدەجووڵایەوە.

بە زۆر سەکی لە دەرگای ماڵ کردە دەرەوە. دەرکاکەی بەست و لە کونی قوفڵەکەوە سەیری دەرەوەی دەکرد. سەکە ئاوڕێکی لە پشت سەری خۆی دایەوە. کلکی لە نێوان پاکانیدا شاردەوە و لە جێگای خۆی هەستا. کەوتە لەتر و نووچدان، بەڵام خۆی ڕاگرت. لە ژێر چاوەوە سەیرێکی دەرکا بەسراوەکەی کرد.

ئارام ئارام و لەرزان لەرزان کەوتە ڕێ، بە سەری خوارەوە کەوتە ڕێ. لە دوا پێچی کۆڵانەکەدا کەڕایەوە، ئاوڕێکی پڕ لە ترس و داڕمانی دایە دەرکا بەسراوەکە و لە پێچی کۆڵانەکەدا ون بوو.

ئەویش ئارام و کەمکەم هاوڕێ لەگەڵ زەمەن و بەسەرچوونی کاتدا و لەگەڵ مامەڵەی شەیتان ئاسایی و پڕ لە سووکایەتی خەڵکدا لەگەڵ کۆمی پشتیدا خزایە پەستووی ناوەوەی ماڵەوە، لە دنیای مرۆڤەکان دوور کەوتەوە و بە نیگایەکی حەپەساوو ماتەوە سەرنجی بڕیە دنیای ڕەنگاوڕەنگ و پڕ شەپۆل و سەرتاپا زەنا.

چەتری کۆماوەی جەستەی بە سەر پشتیەوە قورس نەبوو. کیانی هێنابووە هەشۆکان و ماندووی دەکرد.

پشت کۆم. هەموو بوون و وڵاتی کیانی پڕ کردبوو لە کرێ چڵکنەکان و لە هەویای دۆزینەوەی ڕێکەیەکدا بوو کە لە بنبەستی کرێ شێرپەنجەییەکانی دەرباز بێت.

هەست بە سەرتری و زاڵبوون بکات. ئەم کەسانەی کە بە چاوی سووکەوە سەیریان دەکرد لە بەردەم خۆیدا بە چۆك دابینێ و وایان لێ بکات کە ستایشی بکەن. چۆن پەیکەرەیەکی پیرۆز ستایش دەکەن ئاوەها ستایشی بکەن. بە دەنگی تایە و دەنگی پێ چاوی لە لەکەنە نێستیلیەکە هەڵبڕی و ڕوو بە دیوار دانیشت و ئەژنۆکانی کرتە باوەش و



سەری خستە خوارەوە. دەرکاکە کرایەوە، هەستی کرد کە دەورییەکی پڕ لە خواردن خرایە سەر زیلووە ڕاڕاخۆڵەمێشیەکە. دەرکاکە بەسرایەوە.

دەورییەکەی لەگەڵ پارووە نانێکدا کێشایە پێشەوە. بە بێ‌مەیلەیەوە چەند کەوچەك چێشتی خوارد و پاشان دەوری و کەوچکەکەی شۆرد و دەستەکانی لە پشتەوە گری دا و وەك قالۆنچەیەکی گرفتار لە شەش پالوویەکی بەسراودا. دەستی کرد بە سووڕانەوە بە دەوری خۆیدا و دەستی کرد بە پێداچوونەوە و بەیاد هێنانەوەی یادەوەریە کۆنەکانی.

مامۆستای فەلسەفە لە پەستووی دابڕان و دوورکەوتنەوە دەری هانی و یارمەتی دا کە هەستێت و لەسەر پێکانی خۆی بووەستێ بێ‌ئەوەی گوێ بداتە کۆمی پشتی، بە سەربەرزیەوە لە کۆلانەکاندا بێت و بڕوات.

مامۆستای فەلسەفە دەیووت:

- نرخی مرۆڤ پەیوەستە بە باوەڕ و کردارییەوە. پێگە و جێگەی مرۆڤ بەوەیە کە چەند جەماوەرخواز و مرۆڤدۆست بێت و هەوڵ بدات کە لە ڕێگای ناوات و ئامانجەکانی ڕزگاری مرۆڤدا کار بکات و خۆی لە بنبەستی خۆپەرستی و وشلنەندێشی دەرباز بکات.

بزوسکەی وشە ناورینەکانی مامۆستا کۆکای ڕەشی ناوەز و چوارچێوەی تەنگی ڕوانکەکانی ڕۆشن کردەوە.

مامۆستای فەلسەفە دەیوت:

- هەر کتێبێ شیاوی خوێندنەوە نییە. کتێبی چاك و بەکەڵك لە دروستکردن و ڕچانی کەسایەتی مرۆڤدا ڕۆلی گرنگی هەیە.

خوێندنەوەی کتێبە چاك و بەنرخەکان لە نووسەرە گەورەکان یارمەتی مرۆڤ ئەدات کە بە بۆچوون و ڕوانگەیەکی کراوەترەوە سەیری جیهان بکات. و ئەو پەنای برد بۆ کتێب. شەو و ڕۆژ. کتێب دنیایەکی وا ڕەنگاوڕەنگ و سەیر و شیاوی سەرنجی بە ڕوویدا کردەوە کە کۆمی پشتی لە بیر بردەوە و لە یادی نەما.

شتێ بە قورسایی کێوێکی گەورە زەختی دەخستە سەر گیانی، ئێستا ئیتر هێزێکی دێوناسا لە کیانیدا بێدار ببوو کە حەز و مەیلی لە چاکە و میهرەبانی و جوانی هاودەردی لەگەڵ زوڵملێکراواندا بوو. لە ئەملا و ئەولا و هەموو جێگاکانەوە کەسان و مرۆڤەکان ڕوویان لێدەنا و بە سەرسوڕمانەوە سەیریان دەکرد و بە تاسق و ئەشقەوە گوێیان ئەدایەوە قسە و وشە ناورینەکانی و داوای ڕێکا و یارمەتیان لێ دەکرد.

- ئێستا ئیتر ڕواڵەت و سیمای هەم لە چاوی خۆیدا و هەم لە چاوی دیتراندا جوان و میهرەبان ببوو. ماندوو بوو، لە سەر کومبارە ڕاڕا خۆڵەمێشیەکە دانیشت و کۆمی پشتی نووساند بە دیوارەکەوە، نیگای لە قوولایی لەگەنە ئستیلەکە دزیەوە و کۆمی پشتی خۆی خوراند و بۆ چەند ساتێ بە پشتا راکشا و هەڵچەرخایە سەر لا.

دەنگی بە یەکدادانی تاکانی پەنجەرە هەرە بچووکەکە بەرز بووەوە. بە خێرای ڕاپەڕی و سیگارەکەی بە بڵێسەی ئاور داگیرساند.

* * *

توف و زریان نەك تەنیا درەختە بەرزەکانی بە زەویدا دا، بەڵکو ڕیشەی هەموو گیا جوان و لاوازەکانیشی دەرهێنا و هەر هەمووی کسك دان.

بە بەرچاویەوە درەختە جوان و بلندەکان دەشکان و بە هاوارێکی پڕ کارەساتەوە دەکەوتنە زەوی. مشارێ بە گەورەی و درێژی ئەلبورز کەوتبووە گیان و جەستەی دارستان و دەیبڕیەوە. دەنگی ترسێنەری مشار و کەوتنی درەختە گەورە و کەپ و مەزنەکان ئەوی داڕمان و خۆی دا بە دەستەوە و هاتە سەر چۆك و هەموو گیانی غەرقی ترس کرد. پێش ئەوەی مشار بگاتە هەرێم و سنووری ئەو شکا و داڕما و بەزیبوو. کۆمیەکەی پشتی ئێستا ئیتر بە قورساییەکی تر و زەختێکی گەلێ زۆرترەوە تەنگی پێ هەڵچنیبوو.

لە پشت دارەکانەوە بە دوای ڕێگەچارە و توولەڕێی هەڵهاتنێکا دەگەڕا کە لە زریان و زامی مشار بیپارێزێ.

* * *

ئەو یەك شەوە دوو چاری ئەم گۆڕانە بنەڕەتی و دگەردیسیە نەببوو. بە پێچەوانەی کەسایەتی کتێبی سڕانەوەی کافکاوە. ئەو پرۆسەیەکی درێژی بڕی و هەنگاو بە هەنگاو کەوتە سەرەوخوارکەی گلان و کەوتنەوە.

سەرەنجام بە ڕەوانەکردنی بۆ نەخۆشخانە و عەمەلیاتی کۆمی پشتی لە لایەن تیمێ لە پزیشکە پسپۆڕەکانەوە و ئاشنابوونی لەگەڵ خانمێکی پەرستار لە زەمەنی نەخۆشخانەدا لە ئیجازەیەکی یەك هەفتەییدا زماوەند و هاوسەریەتی ساز دا «جەهیزیەی خانمەکەی ئۆتۆمبیلێکی کیلۆمیتر سفر بوو» سەرەنجام شەوێ کە لە ناو شەش پالووی بەسراودا خەوتبوو بوو بە قالۆنچە. لەم گۆڕان و دگەردیسیە نە شادمان بوو و نە غەمبار.

ئەم گۆڕانەی وەك ڕووداوێکی ئاسایی وەرگرت. ئەو ئیتر ڕێگای کەوتبووە کۆمەڵگای قالۆنچەکانەوە. ئاوەها ئامۆژگاری دەکرد:

- ئێمە هەموومان پێویستمان بە نوێکردنەوەی فێرکردن و بارهێنانە.

پاشان بە نیگایەکی مات کە پریشکێ لە شادمانی تێیدا دەدرەوشایەوە، چاوی دەبڕیە شوێنێك و جێگایەکی دیاریکراو و دەیکردە مەکۆی سەرنجی خۆی.

# پێکەنین

وەرگێڕانی کۆسار فەتاحی

### بەشی یەکەم

ئاغای سەبووری خۆی بەسروشت کابرایەکی شادو دەم بە پێکەنین بوو. بە درێژایی سی ساڵەی تەمەنی هیچ چەشنە ڕووداوێکی ناخۆشی بە سەردا نەهاتبوو. ژنێك و دوو منداڵی هەبوو. بۆ خۆی کارمەند بوو، ژنەکەشی لە دەرەوە کاری دەکرد، داهاتێکی باش‌و خانووو ئۆتۆمبیل‌و چەند فەرشی کاشان‌و تەلەفزیۆنی ڕەنگاو ڕەنگ‌و تەلەفۆن‌و سەلاجەو پارەیەکی دانراوی بانك‌و هەندێ زێڕی لە ماڵەوە هەبوو، لە هیچ شتێ کەمی نەبوو. باڵای سەدو شەست سانتیم‌و سك‌و سمتێکی خڕو قەڵەوو دەموچاوی گوپن‌و دووچاوی زەیتوونی پڕ لە پێکەنین‌و دوو لێوی گۆشتنی سووری بە بزەی هەبوو.

جگەرەی نەدەکێشاو بە لای قومارو مێبازی‌و چاو باشقاڵییدا نەدەرۆیشت، بەڵام هەموو خۆشییەکانی دیکەی ژیانی لا باش بوو. ساڵی جارێکیش ژن‌و منداڵەکانی دەبرد بۆ سەر مەرقەدی ئیمام ڕەزا. ئەو ئێوارە پاییزییە چاکەت‌و پانتۆڵێکی ئوتووکراو کراسێکی هاوڕەنگ‌و گونجاوی کردبووە ژێر چاکەت‌و پانتۆڵە نیلییەکەی‌و بە جووتێ پێڵاوی تازەو جانتایەکی چەرمی کە تێیدا سی لیرەی زێڕو پارەیەکی زۆرو دەستەچەکێکی تێدا بوو بە نێو بازاڕی زێڕنگەرەکاندا دەگەڕا تا بە بۆنەی ڕۆژی لە دایکبوونی کچەکەیەوە کە هاوکات بوو لە گەڵ ساڵوگەڕی زەماوەندەکەیان بۆ کچ‌و هاوسەرەکەی، جووتێ گوارەو ملوانکەیەکی زێڕ نی جوان‌و گرانبەها بکڕێ. بەو بزە هەمیشەییەی سەرلێوییەوە لە بەردەم ئەم جامخانەوە دەچوو بۆ بەردەم ئەو جامخانەو چاوێکی بە ملوانکەو ئەنگوستیلەکاندا دەخشاندو تێدەپەڕی‌و بەو سەختگیرییە هەمیشەییەوە بزەیەکی دەکردو ڕووی لە لایەکی دیکە دەنا. لە قەیسەرییەکە تێپەڕی‌و ڕووی لە بازاڕێکی تر کرد کە یەکێك دەمانچەیەکی خستە پشت ملی‌و وتی: دەستەکانت هەڵێنەو سووکێ بچۆ بۆ لای شەقامەکە! سەبووری بزەیەکی کرد نەیویست لا بکاتەوەو لە گەڵ ئەو کەسەی کە پێیی وابوو "سوحبەتی لەگەڵ ئەکا" قسە بکا کە پیاوە چەکدارەکە پێیەکی خستەبەر پێی‌و بە ئەنیشکی لێدانێکی وەهای لە پشت ملی دا کە خۆی پێڕانەگیراو بە دەما درا بە عەرزەکەدا. پیاوە چەکدارەکە هاواری کرد هەستەسەر پێ، دزی پیس!

خەڵکی نێو بازاڕەکە لە ترسی نیگای تووڕەی کابرای چەکدار هەر یەکەیان وای ئەنواند کە ئەنەهوو هیچ نابینێ. سەبووری کە هێشتا هەوڵی ئەدا سەنگینی‌و گرانی خۆی بپارێزێ‌و پێبکەنێ، هەستایە سەرپێ‌و جانتا چەرمییەکەی توند ڕاگرت‌و لە ترسانا وەك شەقشەقە ئەلەرزی. پیاوە چەکدارەکە وتی" .دستەکانت بخەسەر سەرت‌و بێدەنگ بچۆ بۆ لای شەقامەکە!

چەکەکەی نایە پشت ملی سەبووری و ئەویش بەزەردەخەنەیەکەوە دەستەکانی خستە سەر سەری‌و بە بەردەمی خەڵکە واق وڕماوەکەوە کەوتە ڕێ. لە ئارەقدا خووسابوو و چاوی دەگێڕا، بەڵکوو ناسیاوێك بیبینێ‌و شەفاعەتێکی بۆ بکا. پێش ئەوەی بگەنە شەقامەکە، پێی بە ترسی خۆیدا ناو پرسی: تۆ کێی؟ بۆ تۆمەتی دزیم دەدەیتەپاڵ؟

پیاوە چەکدارەکە وتی: متەقت لێوە نەیەت، وس بە.

لە کەناری شەقامەکەدا ناچار بوو سواری ئۆتۆمبیلەکەی بێت کە دوو کەسی دیکەی تێدا بوو و ڕوویان وەرسووڕاند بوو. ئۆتۆمبیلەکە کەوتە ڕێ. یەکێك لەو سێ کەسە بە چاوبەستێکی ڕەشی ئەستوور چاوەکانی بەست‌و ناچاریان کرد لە نێو ئۆتۆمبیلەکەدا ڕابکشێ. بەتانییەکیان دابەسەرداو پۆستاڵێکیان توند لە سەری قایم کرد. سەبووری وەك کارەبا گرتبێتی، چاوی زەق ببوو و ورتەی لێبڕابوو و لە ترسان وەختەبوو دڵی بتۆقێ.

ئۆتۆمبیلەکە بە خێرایی بە شەقامەکاندا دەڕۆیشت، ئەم تەواو لە سەر هەست بوو بەڵکوو بتوانێ شوێنپێی ئۆتۆمبیلەکە هەڵبگرێ، بەڵام بێ سوود بوو، وتی: بە هەڵەدا چوون، من پیاوێکی شەریفم... ئەمە کەی ڕەفتارە... بۆ کوێم دەبەن.. ئێوە کێن..؟ من شکایەتتان لێدەکەم!



شەفێك بەر چەناگەی كەوتو هەناسەی لێبڕی. لوولەی چەكێكی لە پشت ملیدا هەست پێكردو دەنگێك وتی: وس بە... متەقت لێوە بێ، مێشكت ئەپڕژێنم.

دەنگی ئۆتۆمبیلەكان نەمابوو، هەستی كرد ئۆتۆمبیلەكەیان چووەتە جادەیەكی خاكییەوە... چاڵی و چۆڵی و بۆنی خاك هەراسانیان كردو هاواری كرد: چیتان لێم ئەوێ؟

بێدەنگییەك زاڵ بوو و كەس قسەی لەگەڵ نەكرد. قەیرێكی خایاند. ریزە دیالۆگێك لە نێوان ئەو كەسانەدا دروست بوو كە بۆی ناشنا نەبوون:

-بۆ پێدەكەنیت؟

-وەڵا هەر لە خۆڕا... حاڵەتی لێوەكانم وایە.. من پێنەئەكەنیم

-بۆ نازانی نابێ هەمیشە پێبكەنی؟

-بە حەزرەتی عەباس بەدەست خۆم نییە.

-یانی لە كاتی تازیباریشدا پێئەكەنی؟

-لێوەكانم وا هەڵكەوتوون، خەڵك لێم ناگرن، لێبوردنیان هەیە.

-رەحمەت لە باوكت، پێتوایە ئێمە منداڵین! بێچمی لێوەكانم وایە، بێچمێكت نیشان بدەم كەیف بكەی!

-بێچم بێچم... نابێ پێبكەنی... تێگەیشتی!

-ئاخر چۆن نەبێ من پێناكەنم... حاڵەتی لێوەكانم بۆ خۆیان وان...

-حاڵەت بێ حاڵەت، ئەوەندە فشە مەكە با پەژیوان نەبییەوە.

-ژن و منداڵت هەیە؟

-بەڵێ، ژنێك و دوو منداڵم هەیە؟

-جانتاكەت چی تێدایە؟

-سی لیرەی زێڕو دوو سەد هەزار تمەن و هەندێ بەڵگەنامە...

-لە كێت دزیوە؟ پارەی كام چارەڕەشە؟

-پاشەكەوتی تەمەنێك ژیانە... من پیاوێكی شەریفم

-لێی بپرسن باقییەكەی لە كوێیە؟

-كوڕێكی ناقڵە، بۆ خۆی ئەیڵێ!

-بڵێ نەگبەت... بڵێ تا ئیزراییل گیانی نەكێشاوی... چەندت لە ماڵەوە هەیە

وەڵامەكەی لەقەیەكی توند بوو كە لە ناخەوە ئێشاندی. ئۆتۆمبیلەكە دوای ماوەیەك لە شار دەركەوت. سەبووری زەندەقی چوو، بە دڵەخورپەو ترسەوە پرسی: چیم كردووە؟

لە وەڵامدا بیستی: بۆ پێدەكەنی؟

سەبووری بە سەرسووڕمانەوە پرسی: بۆچی پێكەنین تاوانە؟

لە وەڵامدا بیستی: سەهووت كرد پێكەنیت.

سەبووری زاتی نایە بەرخۆی و وتی: بیچمی من وایە، بە دەست خۆم نییە، هەمیشە پێئەكەنم... لە منداڵییەوە هەر وابووم.

لە وەڵامدا بیستی: گووت خوارد پێكەنیت.

سەبووری پرسی: لە كەیەوە پێكەنین تاوانە؟

-بە خوا من هیچم نییە... ئەوەی هەمەو نیمە هەر ئەمەیە

-ئەی ژنەکەت؟

-کەمێك زێری هەیە

-پێئەکەنیت ها؟ بۆ پێئەکەنیت؟

وەڵا من پێنائەکنیم، بۆ بڕوام پێناکەن؟ لە نێو بازاڕدا هیچ شتێکی ئەوتۆ نەبووە کە من پێی پێکەنم... ئیتر پێناکەنم...بە عەمەلیات لێوەکانم چاك ئەبێ. ئۆتۆمبیلەکە ڕاوەستا، دەستیان گرتو بە چاوی بەستراوەوە هێنایانە دەرەوە، یەکێك جانتا چەرمییەکەی لێوەرگرت، بێدەنگی زاڵ بوو، تەزوویەکی سارد بە لەشیدا هات، بردیانە سووچێکەوەو یەکێك قۆڵبەستی کردو شەقێکی توندیان لە کەلەکەی دا هەناسەی بڕیو کووڕ بوو.

لە هەردوو لاوە هاوکات بە چەشنێکی وا لە گورچیلەیان کوتا کە قیژەی گەیشتە ئاسمانو کەوتەسەر ئەژنۆو لوولی خواردو ناڵەیەکی کرد: ئاخ باوکەڕۆ

-هەستە سەر پێ خوێڕی... هەستە!

-سەبووری کەوتە پاڕانەوە: قەسەمتان ئەدەم بە ئیمام ڕەزا... بڵێن چیم کردووە.. ئێوە کێن؟

شەقێکیان لە کەلەکەی کوتاو هەناسەیان پێ بڕی

-سوێند مەخۆ لەعنەتی... سوێند مەخۆ... بە چی پێئەکەنی؟

سەبووری کەوتە سەر عەرزو لوول بوو. بە پۆستاڵ لەقەیەکیان لە کەلە سەری دا. سەبووری ناڵاندی: گووم خوارد... سەهووم کرد... ئیتر پێناکەنم...

یەکێك وتی: لەسەر پێ ڕایگرنو سەڵەیەکی پێوە بنێن

یەکێك وەها قژی ڕاکێشا کە چاوی پڕ بوو لە ئاوو لەقەیەکیان لە دوولاقی ئەژنۆی کوتا، سەبووری هاواری کرد: ئای باوکەڕۆ مردم!

سەبووری لە قاچی یەکێکیان ئاڵاو کەوتە گریانو بە دەم گریانەوە ئەیوت: لێوەکانم عەمەلیات ئەکەم... بە خوا لێوەکانم عەمەلیات ئەکەم... ڕۆحمم پێبکەن، منداڵم هەیە... چیتان ئەوێ ئەتاندەمێ...

شەقێکیان لە دەمو ددانی کوتاو سوێری خوێنی لە گەروویدا هەست پێکرد. ددانو خوێنی پێکەوە تف کردەوە. دەنگێك وتی: درۆ ئەکەی سەخیف... کڵاو لەسەر کێ ئەنێی؟!

یەکێك وتی: مردن ئەم هەموو گریانو پاڕانەوەیەی ناوێ

سەبووری بە دەنگی بەرز ئەگریاو پێچی لە خۆی ئەداو ئەپاڕایەوەو سوێندی ئەو کەسانەی ئەدا کە نەیئەناسین

یەکێك دەستی گرتو لە پاڵ تاشەبەردێکدا دایناو خۆی کێشایە لایەکەوە. کەسە نەناسراوەکان پێکەوە گفتوگۆیان ئەکرد

سەڵەیەکی پێوەنێن، پەلەمانە

دوو کەس گرتیانو بە مشتو لەقە کەوتنە گیانیو هەڵیانساندەوەو پاڵیاندا بە تاشەبەردێکەوە

یەکێك وتی: وەسییەت بکە!

فرمێسك لە ژێر چاوبەستەکەوە تێکەڵ بە تەپو تۆزەکە (ئەبوو و بە دەموچاویدا ئەهاتەخوارێ. سەبووری ناڵەیەکی کرد: خانوو... فەرش... هەرچیتان بوێ... لەبەر منداڵەکانم...

یەکێك لە پیاوەکان شەقەزلەیەکی وەهای لە بناگوێی سرەواند کە خوێن فیشقەی کرد. قیژاندی بەسەریدا: وس بە... سەگباب!

لە نێو ئەو بێدەنگییەدا کە تەنیا باڵندەیەکی دوور دەیشکاند، نەناسێك فەرمانی دا: لێیدەن!

ڕیزە فیشەکێك وردەبەردی بە سەروچاویدا پژاند. پێکەنین بۆ هەمیشە بە لێویەوە نەما.

نەناسێکی دیکە قیژاندی: سەگباب باش سیلەی لێبگرە

ئەژنۆی سەبووری شکاو کەوتە سەر عەرزو لوول بوو. نەناسێك کە بە هێمنی قسەی دەکردو دەنگێکی ناخۆشی نەبوو وتی: سەبووری کوڕێکی چاکە، وازی لێبێنن، من گرەنتی ئەکەم ئیتر هیچکات پێنەکەنێ

ئەو کەسەی کە لە نێو بازاڕدا دەمانچەی نابوویە پشت ملیو سەبووری لە نێو ئۆتۆمبیلەکەیدا بۆ ساتێك دەموچاوی دیبوو، وتی: بە مەرجێك زێری ژنەکەیمان بۆ بێنێ

ئەو دەنگەی کە ناخۆش نەبوو، وتی: زێڕەکانی ژنەکەت بێنەو ئیتر کوڕێکی باش بەو پێمەکەنە باشە؟

سەبووری بە جوولەی سەر قبوولی کرد. کەسە نەناسراوەکان جەستەی سەبوورییان خستە نێو ئۆتۆمبیلەکە. یەکێك بە دەسماڵێك دەموچاوە خوێناوییەکەی خاوێن کردەوەو دەستەکانی کردەوە. دوای چەند ساتێك ئۆتۆمبیلەکە کەوتە ڕێ، تاریکایی ئێوارە گەیشتە کۆڵانێکی سەرووی ماڵی سەبووریو ڕاوەستا. هۆشداریان پێدابوو کە ئەگەر هەڵەیەك بکا، ژنو منداڵەکانیشی هەر بەو دەردە دەچن. سەبووری ڕاستگۆیانە سوێندی بۆ خواردن کە هەڵە ناکا. چاوبەستەکەیان کردەوەو پێیان وت لا نەکاتەوە. ئەو پیاوەی دەمانچەی خستبووە پشت ملی، لە تەنیشتییەوە کەوتە ڕێو وتی: مەچۆرە ژوورەوە، هەر لە دەم دەرگاوە پێیان بڵێ زێڕەکانت بۆ بێنن، تێگەیشتی؟

سەبووری کە بۆ هەمیشە پێکەنین لێوەکانی بە جێ هێشتبوو، وتی: بەسەر چاو! زەنگی دەرگاکەی لێداو کوڕەکەی هاتە دەرەوەو سڵاوی کرد، سەبووری خۆی کێشایە نێو تاریکییەکەی و وتی: کوڕم زێڕەکانی دایکت بێنەو پرسیارم لێمەکە، ئیشم پێیەتی.

کوڕەکەی ئاغای سەبووری چووە ماڵەوەو دوای کەمێك گەڕایەوەو زێڕەکانی دایکی کە لە نێو سندووقێکدا بوو، دایە دەستی باوکیو گەڕایەوە. ژنەکەی سەبووری گۆشەی پەردەکەی لاداو هەوڵیدا دەموچاوی کابرای تەنیشت سەبووری ببینێ، کە بینی. پیاوە نەناسەکە دەرگای سندووقەکەی کردەوەو دڵنیابوو و بە سەبووری وت: ئەگەر بتەوێ دوای ئەم مەسەلەیە بکەوی، جارێکیتر کەس بەزەیی پێتدا نایەتەوە. کوڕی چاك بەو ئیتر پێمەکەنە.

سەبووری وتی: بەسەرچاو

پیاوەکە دوور کەوتەوەو سەبووری چووە ژوورەوەو دەرگاکەی داخست

### بەشی دووەم

دوای ئەو ڕووداوە کە لە خەوێکی ترسناك نەچوو، سەبووری تەنیایی هەڵبژارد. ئیتر هاتووچووی لەگەڵ خزمو بێگانە بڕیو بە تەواوەتی چووە نێو خۆی. بە مانگێك وشكو ڕەق هەڵاتو پەنجا کیلۆ دابەزی. دەموچاوی تەواو بوو-و بە چرچو لۆچ. قژەپڕو زۆرەکەی بۆر بوو. لە ترسی ئەوەی نەکا ژنەکەی لای خزمو کەسو کاری باسی بکات، سەرباری هەموو هەوڵو تەقەلایەکی هاوسەرەکەی هیچی بۆ نەگێڕایەوە. شەوان کە دەنووست دەمووچاوی ئەو پیاوەی کە لە نێو بازاڕدا دەمانچەی خستبووە پشت ملی، دەهاتە پێش چاویو بیری تۆڵە تەزووی دەهێنا بە لەشیدا.

نە سەیری تەلەفزیونی نەکرد، نە گوێی لە ڕادیۆ دەگرت، نە نەچووە پارکو نە سینەمای نەبینی. پێی لە شاییو شیوەنی خزمو ناسیاو بڕیبوو. تەنیا بیری لە یەك شت نەکردەوە: تۆڵە!

تۆڵە لەو کەسانەی کە وا سووكو تڕۆیان کردبوو و بە ڕۆژی ڕووناك بە بەرچاوی خەڵکەوە ڕفاندبوویانو پێکەنینیان لێنەستاندبوو. جارێك کابرای دەمانچەکەی دیتبوو کە وەك ڕۆبۆت سەری بەم لاو ئەولادا نەگێڕاو چاوی لە خەڵکەکە دەکرد.جارێکیتر لە نێو بازاڕدا هەر ئەو کابرایەی بینیبووەوەو دوور بە دوور کەتبووە دوایو تا نزیك ماڵەکەی ڕوێشتبوو. بەرەبەرە ئاسەواری ترسەکەی وەریو ڕقێکی ڕەشو ئاگری تووڕەیی جێگای گرتبووەوە. بە خۆی دەوت: دەساڵی تریش بووبێ، ڕادەوەستمو لە کاتی خۆیدا تۆڵەیان لێدەکەمەوە.

شەوێك تەلەفوون زەنگی لێدا، هەڵیگرت، دەنگێك کە ناخۆش نەبوو وتی: ئافەرین سەبووری! ئەمانزانی کوڕێکی باشیو ئیتر پێناکەنی. کوڕی چاك بەو دەست بە کڵاوی خۆتەوە بگرە تا با نەیبا. شەوباش، کوڕی چاك.

سەبووری تەلەفوونەکەی داخستەوە. هەستایە سەرپێو لە ئاوێنەکەوە لە خۆی ورد بووویەوە. پێکەنین بۆ هەمیشە لێوەکانیان بە جێ هێشتبوو. دەستی خستە نێو قژەکانی، ماوەیەك ئەم سەرو ئەو سەری کردو چوو ئەلبۆمی وێنەکانی سەردەمی دواناوەندی هێناو لە سووچێکەوە دانیشتو کەوتە سەیرکردنی وێنەکانی خۆیو هاوپۆلەکانی. لە نێو وێنەکاندا چاوی کەوت بە وێنەی "ئاروین" کە لە تافی لاوێتیدا سەبارەت بە بەرگریکردن لە حەقیقەتو ئەو ئامانجانەی کە سەد ساڵ بوو کۆمەڵگە لە بیری کردبوو، کەوتە گۆشەی بەندیخانە. سەبووری هەمیشە لە دوورەوە ئافەرینی پێدەوت، بەڵام وەك قوتابیەکانی دیکە لە ترسان لێی نزیك نەئەبوویەوە. دەیانوت ئاروین کەسێکی خەتەرەو هەر کەس لەگەڵیدا بگەڕێ داهاتووی فەوتاوە. سەبووریش هەر بەر ئەوەی کە لە داهاتوودا نەکەوێتە ژێرپرسیار، خۆی لێ دوور دەخستەوە. بەڵام لە ناخەوە ڕێزی بۆ ڕەوشتی بەرزی، ڕاستگۆیی، ئازایەتی، یەکرەنگیو نەفسبەرزی ئەو دادەناو ستایشی دەکرد.

ئاروین، ئەو هەستانەی کە کۆمەڵگە نرخی بۆ دادەنا وەك،



پارەپەرستی، دەسەڵاتخوازی، ناوبەدەرکردن، لە خوێدا ڕیشەکێش کردبووو لە جیاتی ئەوانە خۆشەویستی بۆ زانین (مەعریفە)، بۆ نیشتمان، بۆ مرۆڤایەتیو خۆشەویستی بۆ حەقیقەتو ڕاستی لە جێ دانابوو. ئاروین لە کۆمەڵگە تەریك کەوتبوو، لە کۆمەڵگەیەك کە پێوەری بەهاکان لای ئەو پارەو شەهوەتو دەسەڵات بوو.

سەبووری بڕیاری دا کە شوێن ئەو تەریککەوتووە بکەوێ.

سەرچاوە: **WWW.mani-poesie-de**

# دیدار لەگەڵ مەنسووری یاقوتی

وەرگێڕانی: مازیار عومەر

به كورتی باسێكی ژیانی خۆتمان بۆ بكه...

– من له ڕۆژی بیست و نۆی ڕەشەمێی ساڵی ١٩٤٠ی زایینی له ئاواییەك له نێوان ئیسلام ئاباد و گیلان غەربدا له دایك بووم كه دانیشتوانەكەی كەلهوڕ بوون. به هۆی مردنی باوكمەوه چووم بۆ كرماشان و تا ساڵی ١٩٧٩ و تەواو كردنی قۆناغی دواناوەندی لەم شاره بووم. خاوەنی هاوسەرێك و كوڕو كچێكم كه هەر دووكیان زنكۆیان تەواو كردوه و له ساڵی ١٩٧٩وه تا ئێستا نیشتەجێی شاری هەمەدانن. دوای تەواو كردنی قۆناغی دواناوەندی چوومه پەیمانگەی ئەفسەری پولیس و له شارەكانی كرمان، ڕەفسنجان، كرماشان، قەسری شیرین، خوسرەوی، تاران، مەلایەر، نەفت شار، یاسوج و هەمەدانْ خزمەتم كردوه و ساڵی ١٩٨١ و له تەمەنی ٤٢ ساڵیدا به هۆی هەندێ گرفتی خۆمەوه به پلەی سەرهەنگ(نەقیب)ی خۆم خانەنشین كرد..

*پ– له كەیەوه دەستت كردوه به شعر نووسین؟ له سەرەتای كاری شعر نووسیندا چ كەسانێك كاریگەریان هەبووه بەسەرتەوه؟ 'ئەمڕۆ (گەرچی دەڵێن شعر پێناسەی نیه) شعر چۆن پێناسه دەكەی؟*

و– ئاشنای من له گەڵ شعردا له منداڵییەوه و له ناو عەشیرەت و له گوندا دەست پێدەكات، به خوێندنەوەی شاهنامه، خوێندنەوەی حافز و گوێگرتن لەو چیرۆك و بەسەرهاتانەی كه خاڵم(لەو كەسه كەمانەی خێڵەكەمان بوو كه خوێندەواریان هەبوو) شەوانه بۆ كەسانی تری دەخوێندەوه، پاشان له قوتابخانه له ڕێگەی كتێبه دەرسییەكان و مامۆستا و بەڕێوەبەرەكان و هەروەها خوێندنەوه كتێبی تری جیا له وانەكانی قوتابخانه كه حەزم پێیان بوو زیاتر ئاشنا بووم. بەڵام له قۆناغی دواناوەندی و له قوتابخانەی "كوزازی" كه حەتوونامەیەكی دیواریمان بڵاو دەكردەوه سەرم كرده شعر نووسین و له بەختی خۆم هەندێ مامۆستای زۆر دڵسۆز و ڕێزدارم هەبوون كه هانیان دام و زۆریان فێر كردم و هەر ئەوانیش بوون كه بۆ یەكەم جار شعرەكەمیان دا به ڕۆژنامه هەرێمایەتییەكان و چاپ كرا. ئێستاش ئەو ڕۆژنامانەم ماون بەڵام دۆزینەوەیان قورسه. ئەم شعرانه گەنجانه و كرچ و كاڵ و زۆر ئیحساسی و عاتفی بوون، له ساڵانی خزمەتی پۆلیسیدا ئەگەرچی هەرگیز له شعر دوور نەكەوتمەوه و بەردەوام دەمخوێندەوه بەڵام زیاتر سەرقاڵی نووسینی بیرەوەری و لێكۆڵینەوه له هەلومەرج و ڕەوشی خەڵكی ئەو شارانه بووم كه خزمەتم تیادا دەكردن، بەڵام تەواوی ئەمانه چەندین بواری



گونجاو و باگراوەندێكی دەوڵەمەند و كارامه بوون كه دوای خانەنشینی، ئەم جارەیان نه بەپێی حەز بەڵكو بەپێی پێویستێكی زۆری ڕۆحی و له ڕاستیدا ناچارییەك بوو "دوای بیست ساڵ وەستان سەرلەنوێ پەنام بردەوه بەر شعر" و ئێستاش بەردەوامم، بەجۆرێك كه ئێستا سێ كتێبی چاپكراو و چوار كتێبی چاپ نەكراوم هەیه، به ساڵاچووم و كاتم كەمه و ساڵانی بی فیڕۆ چووم زۆره و ناچارم كاری زۆر بكەم.

من لەگەڵتام كه پێناسەیەك بۆ شعر نیه. ئەو پێناسانەی تا ئێستا بۆ شعر كراوه تەواو و گشتگیر نین، بونموونه ئەگەر شعر به وتەیەكی خەیاڵ ئامێز و كێش و سەروادار بزانین خۆ نییەتی چەپەڵیش دەتوانێ ببێته خەیاڵ ئامێز و كێش و سەروادار، بێ ئەوەی هیچ فۆرمێكی شاعرانەشی پێوه دیار بێت. منیش ناتوانم پێناسەیەكی كورت و هەمەلایەنه و تەواوەتی شعر بكەم، من زیاتر له نیو سەده به قوڵی شعرم خوێندۆتەوه و بیست ساڵیش زیاتر شعرم نووسیوه، كۆی ئەم دوانەم ئاوێتەی زەینیات و ئەزموونەكانی خۆم كردوه و بەم ئەنجامه گەیشتووم كه هیچ زمانێكی ڕەسمی، ڕێزمانی و وتەی لۆژیكی له دنیادا ناتوانێ تەواوی ئەو شتەی له

زەینی کەسێکدایە، بەهەمان هەستو وێنەو بیرکردنەوەیەك کە هەیەتی بگوازێتەوە بۆ زەینی کەسێکی تر. مەگەر ئەوەیکە پەنا بەرێتە بەر درێژدادڕی، بە هەموو ئەمانەشەوە، لە ڕستیدا پەخشان دەتوانێ ڕەوش، هەست، وێنە یان ئەندێشەیەك باس بکات، بەڵام ناتوانێ سەرلەنوێ ئەو شتانە لە زەینی کەسێکی تردا بخولقێنێتەوەو مادییەتی پێبدات. بەڵام شعر لە لوتکەی گەشە کردنی خۆیدا دەتوانێ بە کەڵك وەرگرتن لە: شوبهاندن(تشبیه)، سیفەت، هێماو وردەکاری دیکە بە کەمترین وشە، شاراوەترین ڕەوشی دەروونی(بەو شێوەی کە هەیە) لە زەینێکەوە بگوازێتەوە بۆ زەینێکی تر. من لە کۆتایی شعرێکدا بەناوی (پارچە "قطعة") بۆ دەربڕینی ڕەوشی دەروونی دایكو باوکێکی جەرگ سوتاو و کۆست کەوتوو کە بە سەر گۆڕی کوڕە جوانەمەرگەکەیانەوە دەگرین، وتوومە: **ابری از زمین به اسمان بارید**(واتە هەورێك لە زەوییەوە بەرەو ئاسمان باری)

سەیر دەکەی وەها شتێك نەڕاستەو نە لۆژیکییەو تەواو پێچەوانەی یاسای کێشکردنی زەوییەوە کەم تا زۆریش شتێکی مەحاڵەو تەنیا دەکرێ لە خەیاڵدا قبوڵ بکرێ. هەربۆیە من نەك بەمەبەستی دەربڕینی پێناسەیەك بەڵکو وەك ڕای شەخسی خۆم لەو بڕوایەدام کە: "شعر وتەیەیە کە بتوانێ بە کەمترین وشە، سەرلەنوێ هەست، سۆز، ئەندێشە یان وێنەیەك لە زەینی کەسێکی تردا بخولقێنێتەوە، نەك تەنیا ڕاپۆرت بێتو زانیاری بگەیەنێت. من بۆ گەیشتن بەم مەبەستە بە کار هێنانی هەرچەشنە تەکنیکێك بە ڕەوا دەزانمو هەمیشە بەدوای دۆزینەوەی تەکنیکگەلێکی لەو چەشنەوەم. هیوادارم کەس بە وەڵامەکەم دڵگران نەبێت، پێویستە ئەو بزانین پرسیارەکەی تۆ زۆر گشتییەو دە تا دوازدە سەدە شعری کلاسیکی ئێران دەگرێتەوەو من مەبەستم هیچ شاعیرێکی تایبەت نییەو بێگومان ئەو گلەیی یان ڕەخنەیەی کە هەمە خۆشم دەگرێتەوە. من لەو بڕوایەدام ئەگەر لەناو بارستایی گەورەی شعری کلاسیکی ئێراندا لەناو تەواوی مانا، شوبهاندنەکان، وێنەکانو تەوسیفەکاندا باشترین نموونە هەڵبژێرینو لەوانی تری جیا بکەینەوەو لە هەر یەکێکیان تەنیا نموونەیەك لە کتێبێکدا کۆبکەینەوە، ڕەنگە کتێبێك دەرچێ لە قەبارەی یەکێك لە دیوانە شعرییەکان، ئەگەر بەم شێوەیە کۆمەڵە شعری شاعرێك گوڵبژێر بکەین، ڕەنگە تەنیا نامیلکەیەکی بچوك دەربچێ. من ئەو گوڵبژێرە لە لوتکەدا دەبینمو تا ئاستی پیرۆزی ڕێزی بۆ دادەنێمو لەو بڕوایەدام بەرهەمی ماندووبوونێکی داهێنەرانەی شاعرە گەورەکانمان دەبێ، بەڵام ئەوەی دەمێنێتەوە بە شعری دەستوپێگر، دووپاتە، زیادەو هەر لەبنەڕەتەوە کەمکەرەوەو تێکدەری شعری کلاسیکی ئێرانی دەزانم. من هیچ داهێنەرییەکی شاعرانە لە دووپات کردنەوەو وەرگرتنو نموونە سازیدا نابینمو لانی زۆرەکەی دەتوانم بە جۆرە لێزانییەکی دانێم وەك ئەو کەسانەی کە دەتوانن لاسایی گۆرانی بێژەکانی تر بکەنەوە.

من حەزم بە شعری جوانە، جا هی هەرکەسێك بێتو حەزم بە شعری خراپ نیە جا ئەگەر هی حافزیش بێت، بۆ نموونە:

دەردی ئێمە بێ دەرمان، هاوار
یان
دڵم لە هەوای ڕووی فروخ

و لانی کەمەکەی دە دوانزە غەزەڵی تر کە لەبەر ڕەچاوکردنی پاشو پێشی ئەلفوبێی سەرواکان هۆنراوەنەتەوەو خۆزگە وای نەدەکردو چاوپۆشی لەو سەروایانە دەکرد کە بە پیتەکانی پ، ح، ج، خ، ص، عو هتد کۆتاییان دەێت. هیچ شاعرێکی تریش ناتوانی بە بەکار هێنانی سەرواگەلێکی لەو چەشنە شعر بخولقێنێ.

***پ- شعری کلاسیکی ئێران چۆن هەڵدەسەنگێنی؟ زیاتری هۆگری کام یەك لە شاعرە کلاسیکییەکانی ئێرانیو بۆچی؟ بێگومان هەنگاوەکەی نیما پێش زەمینەگەلێکی هەبوو. ئەگەر دەگونجێ هەندێك لەسەر دروست بوونی شعری نیمایی بدوێی.***

پەیوەندیو ئاڵوگۆڕی کلتووری ئێمە لەگەڵ هیندستانو دنیای عەرەب مێژوویەکی دوورو درێژی هەیە، بەڵام پەیوەندی هونەری، هزریو کلتووری زمانی ئێمەو نەتەوەکانی تر، تەنانەت سۆڤیەت کە دراوسێی نزیکی ئێمە بووەو لە سەدو دە تا سەدو بیست ساڵ تێناپەڕێ، نموونەگەلێکی کەمیشی لەو چەشنە پەیوەندیانە لە گەڵ تورکیای عوسمانیدا بووە. بەشەکانی تری دنیا ئاگایان لە ئێمە نەبووەو نیەو ئێمەش لەوان بێ‌ئاگاین. ڕووداوە سیاسییەکان، شەڕەکان، دەستدرێژیە کۆنالیستییەکان، بەرەو پێش چوونی پەیوەندییەکان، هاتووچۆکانو چەندین هۆکاری تر زۆرێك لە وڵاتان ئێمەی لەگەڵ ئاسۆ دوورە دەستەکان ئاشنا کرد. نیما لە قوتابخانەی" سن لوی" تاران خوێندبوویو فێری زمانی فەرەنسی ببووو زەوقێکی هونەریو شاعرانەی هەبوو، بەخت یاوەری بوو کە لە ڕێگەی زمانی فەرەنسییەوە توانی دەستی بە ئەدەبی فەرەنسیو ئەدەبی ڕۆژئاوا ڕابگات. نیما تێگەیشت کە شعری هەزار ساڵەی ئێران ، لە لوتکەی خۆشیدا جیا لەهەندی حاڵەتی ڕیزپەڕ(استثناء) بە گشتی لە چواچێوەی چەند بابەتی سەرەکی وەك: عەشق، عیرفانو حەماسەدا چڕ بۆتەوە، لە کاتێکدا لە ڕۆژئاوا شعر خۆی تەنیا لەم چەمکانەدا قەتیس نەهێشتۆتەوەو خۆی بە هەموو بابەتەکانی ژیانی مرۆییەوە خەریك کردوەو لەوێ بوو کە هەوڵیدا چوارچێوەی شعر بەرفراوانتر بکات و بیکێشێتە ناو مەسەلەکانیتری کۆمەڵگەی مرۆییەوە، لەگەڵ شێوەی چەندین کێشەی دیاریکراو و عروزیو سەروادا بەرەو ڕوو بوو، لە ناچاریدا وازی لێهێنانو دەستو باڵی خۆی ئازاد کرد. هەمووما دەستکەوتی ئەم ئازایەتییە دەبینین.

***پ- بۆچی ئەو بزوتنەوەیەی کە نیما دەستی دایە دەوامی نەهێنا؟ ئەگەر لەو بڕوایەدای کە موسیقا(ئاواز- ریتم) جەوهەری شعر پێکدێنن، ئەی ئەو هۆنراوانە چۆن هەڵدەسەنگێنی کە مۆسیقا و هارمۆنیان تیا نییە؟:***

لەوەدا کە بزوتنەوەکەی نیما بەردەوام نەبووە لەگەڵتا نیم. ئەو وەك داهێنەرە گەورەکان ئامێرە داهێنراوەکەی خۆی لە نموونەیەکی دەست سازداو بە کەرەسەی سەرەتاییو ڕەنگە قورسو ئاڵۆزو قەبارەدار دروست کردوەو ئیتر ئەوە ئەرکی کەسانیترە کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کامڵی بکەنو واشیان کردوە، ئەمڕۆ ئەو موبایلەی کە بە دەست خەڵکەوەیەو بە قەدەر قاپوڕە شقاتەیەك دەبێو هەزاران کیلۆمەتر بڕ دەکات، بەرهەمی "گراهام بێل"ە (ئەگەر هەڵەم نەکردبێ) کە دەبوو بە چەندین کەس هەڵیگرنو بیگوازنەوەو مەودای بڕکردنەکەشی لەم ماڵ بۆ ئەو ماڵی دراوسێ بوو و هیچ لە تەلەفۆنەکانی ئەمڕۆ ناچێ. من تەواوی نوێخوازانی ئەمڕۆی ئێران، تەنانەت پۆست مۆدێرنەکانیش بە بەرهەمو ماندوو بوونی نیمایان

دەزانم! شێوازێکیتر ئەوەیە کە سەرکەوتنی نیما زۆر کەسی هان داوە خۆیان وەك داهێنەرانی شێوازێکی نوێ بە چەندین ناوی جۆراوجۆرە بناسێنن‌و ناویان لە ناو ناواندا بمێنێتەوە! ئەگەر نیما نەبایە ئێمە ئەمڕۆ نە کەسێکمان بە ناوی شاملوو دەناسی‌و نە کەسێك بە ناوی ئیخوان‌و فروغ یان سپێهری. نە کەسێك بەناوی ،ئاتەشی،و نە کەسانیترو نە تەنانەت بچووکترینیشیان.

***پ- ئەو هۆنراوانە چۆن هەڵدەسەنگێنی کە مۆسیقاو هارمۆنییان تیا نیە؟***

و- سەرەتا پێویستە ئەو شتە قبوڵ بکەین کە مۆسیقا(هارمۆنی، ئاواز، ریتم) لە پێویستییەکانی شعرە. هەروەها پێویستە ئەوەشمان قبوڵ بێت کە ئەو شعرانەی هیچ چەشنە مۆسیقایەکیان تێدا نیە قورسە بە شعر لە قەڵەم بدرێن. بەڵام سەبارەت بە مۆسیقای شعر قسەم زۆرەو لەو بڕوایەدام کە لە بواری مۆسیقای شعردا هەمان کێشەو گرفت هەیە کە سەبارەت بە عەروزی شعری فارسی لەئارادایە، بەو واتایەی کە ئەگەر شعرێك لەگەڵ کێشی عەروزی شعردا(رەمل، متقارب‌و...) نەیاتەوە شعری رەسمی، یاسامەندو باو نیە، لە مەڕ مۆسیقای شعریش پێویستە بۆ نموونە(دەشتی، ماهور، شور، همایوون‌و...)بێ‌و ئەگەر نەتوانرێ ئەو شعرە لە یەکێك لەو دەزگا ئێرانیانەدا بە ئاوازەوە بخوێندرێتەوە، مۆسیقاو هارمۆنی تێدا نیە. لە کاتێکدا بەو جۆرە نیەو ئەگەر بکرێ بە واتا رەها، گشتی‌و جیهانیەکەی لە مۆسیقا بڕوانین، تێدەگەین کە زۆربەی ئەو شعرانەی کە دەوترێ مۆسیقایان تێدا نیە. خاوەنی مۆسیقاو هارمۆنی‌و ئاوازن، خوالێخۆشبوو "شاهۆ" زۆربەی شعرە سپی، نوێ‌و بێ کێشەکانی خۆی خوێندۆتەوەو مۆسیقای دەقی بۆ داناون. رەنگە ئەو مۆسیقایە سەمفۆنییەك یان گیتارێکی ئیسپانی یان پیانۆیەکی ئەڵمانی بێت کە هەر چۆنێك بێت شعرو مۆسیقا تەواو پێکەوە یەکتر دەخوێننەوەو هاوئاهەنگن‌و لە بەرامبەردا رەنگە نەکرێ ئاهەنگدارترین غەزەڵەکانی حافز لەگەڵ سەمفۆنی یان ئاوازێکی ریتمداری رۆژئاوایدا هاوئاهەنگ بکرێ، ئێمە تا سنورو چوارچێوەی مۆسیقا بەرفراوانتر لەبەر چاو بگرین، دەکرێ شعرێکی زۆرتر بە مۆسیقادار بزانین کە پێمانوایە مۆسیقایان تیدا نیە. هەروەها پێویستە گوێیەکانمان ڕابێنین لەگەڵ جۆرەکانیتری مۆسیقای جیاوازو باتر لە مۆسیقای ئێرانی، تا بتوانین ئەو میلۆدییە زۆر وردو ناسکانەی کە لە زۆرێك لەو شعرانەی بە بێ کێشی‌و تیا نەبوونی مۆسیقا بەناوبانگن، دەست نیشان بکەین. بۆ ئەو مەبەستە کۆپلەیەك لە هۆنراوەکانی خۆم بە نموونە دێنمەوە.

تۆم لەبیر کردوە  
بەو جۆرەی  
کە بیابان دەریای لە یاد کردوە  
خۆڵەمێشیش  
بەهارو گەڵاو باڵندە  
تەنیا، نەتەوە  
بە چەشنێکی سەیر،  
وەك بای ناو قامیشەڵان‌و  
بارانی ناو گۆلاوێکی  
دوورە دەست، زەینم ئاڵۆز دەکات  
...

دەکرێ ئەم شعرە بە شێوەی ئاسۆیی‌و بە نووسینی ئاسایش بنوسرێ‌و وەك شعرێك بناسێنرێ کە مۆسیقاو هارمۆنی تێدا نیە، بەڵام بە رای من ئەم شعرە مۆسیقایەکی بەهێزی تیدایەو گۆڕینی هێجاکانی هەر یەکێك لە وشەکانی، بۆ نموونە گۆڕینی (ئاڵۆز دەکات) بۆ (تێکیدەدات) یان (خۆڵەمێش) بۆ (درەخت) مۆسیقاکەی دەشێوێنێ.

***پ- سیاست دەکەین ئەگەر روانگەی خۆت لەسەر شعری رەسەنی هاوچەرخی ئێران بە بوونی کەسانێکی وەك نادرپوور، نوسرەت رەحمانی، فروغ، ئیخوان، ئەحمەد شاملوو و ... بەیان بکەی.***

روانگەکەم تەواو شەخسییەو هەر چەشنە دژایەتێکیش هەبێ لەبەرامبەریدا بە چاوی رێزەوە سەیری دەکەم. من "هونەری بێ مرۆڤ"و "مرۆڤی بێ هونەر" تەواو بە هاومانا دەزانم. مرۆڤەکان تەنها گەورە شاعرو عاشق‌و مەعشوقەکان نین‌و دەردو ئازاری مرۆڤەکانیش تەنیا هۆگریەکانیان نیە، من لەبەر رێزی ئەو مرۆڤەی کە بژێوی خۆی پێ پەیدا دەکات (تاکسیە،قەمەرە، شەرەی نەفەراتیشم) خستۆتە چوارچێوەی قەدەغەکراوی شعرە)وە. ئەم تێڕوانینە هیچ جیاوازێیك لە نێوان شعری نوێ‌و کلاسیکدا دانانێت. من لەو بڕوایەدام شعری ئێمە بە رێگەیەکی راست، مرۆیی‌و هونەرمەندانەدا دەچوە پێش، بەڵام فاکتەرگەلێکی زۆری بەلارێدا بەرو پاشکەشە پێکەر شاڵاویان هێناوەتە سەری‌و ئاراستەکەیان گۆڕیوەو ئێستا ئەرکی سەر شانی سەرجەم دڵسۆزانی شعرو ئەدەبی فارسی ئەوەیە کە سەربەخۆیی‌و سەربەستی بۆ بگێڕنەوەو لە مرۆڤ جیای نەکەنەوە، من بە چرا کزەکەی خۆمەوە ئەم مەبەستەم گرتۆتە بەر. بەداخەوە ئەوانەی کە رۆشتوون جێنشینیان نیە.

هونەر خۆی لە خۆیدا پێویستی بە لێهاتوویی، زەوق، توانای داهێنان، زەینێکی وردبین‌و جوانیناس‌و هەروەها پێویستی بە پەروەردەو فێرکردنێکی ماندوو نەناسانە هەیە، هەر بۆیە لە رابردوودا لە دەیان هەزار کەس تەنها یەك نەفەر دەیتوانی ببێتە هەنەرمەند. ئێستا هەندێ کەس پەیدا بوون کە ئەو تایبەتمەندیانە بۆ هونەرمەند بوون بە پێویست نازانن‌و لایان بردوون‌و وایان کردوە کە هونەر لە قۆرغی هونەرمەندان بێتە دەرو لە راستیدا وەك سەرچاوە سروشتییەکان بە ناو هەموو خەڵکدا دابەش بکرێ!

هەندێ نیگار کێش پەیدا بوون کە رافایل‌و داڤینچیان قبوڵ نیەو بە سەتڵ چەندین رەنگی جۆراوجۆر بە دیواردا هەڵدەپرژێنن‌و ئەوەی کە دروست بوو وەك تابلۆی هونەری نەقاشی بەهەموانی دەناسێنن، هەندێ پەیکەر تاش پەیدا بوون کە "رۆدن"و "مایکل ئەنجیلۆ"یان قبوڵ نیەو ئاسنە شکاو و شیش‌و تەنەکەو سیمی راکێشانی سەیارە پێکەوە لەحیم دەکەن‌و دەیخەنە سەر بنە کۆڵەکەیەك‌و لافی کەرامات لێدەدەن. لە شعریشدا رووداوگەلی لەو چەشنە روویداوە. ناوەرۆك، ئەقڵ، لۆژیك، رێزمان، بەرپرسیاریەتی کۆمەڵایەتی، واتاو تەواوی شتەکانیان لابردوە کە بە بڕوای من گیا بۆن خۆش‌و شیفابەخشەکەیان دە جار کوڵاندوەو ئاوەکەیان رشتووەو تەنها تڵپەکەی ماوەتەوە، رەنگە ئەم کارە حیکمەتێکی تێدا بێت‌و من هەستی پێنەکەم، لە خۆیان پرسیار بکە! بێگومان زاناگەلێك هەن کە لەم بارەوە روونکردنەوەو بەڵگەیان بەدەستەوەیە کە بۆ ئەوە دەبێ بیری لێبکرێتەوە، بەڵام ئەو لێشاوە شاعرە مودێرن‌و سوپەر مودێرنانەی کە بڵاوکراوەکانی وڵاتیان قۆرغ کردوە، تەنانەت ناوی ئەو زانایانەش نازانن‌و بە تەواوی بێ‌ئاگان لەو شتانەی کە وتوویانە. بەداخەوە رواڵەتێکی روونـاکبیری‌و پێشرەوانەی هونەری بەم (پاشا گەردانییە) دەبەخشن.

سەرچاوە: www.balout.com

# (دێو) لە دیدێکی ئەفسانە ناسیەوە

نووسینی: مەنسور یاقوتی
لەفارسیەوە: ڕێبوار



فیردەوسی لە شیعرێکیدا دەڵێت:

"تۆ دێو بە خەڵکانی بەد بزانە

ئەو کەسانەن کە سوپاس گوزاری یەزدان نین"

لە جێگایەکی تردا دەڵێت:

"ئەو کەسەی لەسەر ڕێگای خەڵکی نەڕۆیشت

بەدێوی بزانە، نەك بە مرۆڤ"

لە شانامەدا، کاتێك باس لە سەردەمی شا جەمشید دەکات، دێو وەك ئەندازیار و تەلار ساز خەریکی دروست کردنی حەمام و پردو خانوون. وەك لە شیعرەکانی فیردەوسیدا دەردەکەوێت دێو لە ڕەگەزی مرۆڤبووە، چونکە وشەی "خەڵك" یان بۆ بەکارهاتوە، بەپێی بەیتی دوەم، دەتوانین بڵێین: کە دێو لەڕووی باوەڕو مەزەبەوە لە مرۆڤ جیایەو خاوەنی بیروباوەڕی ترن (ئەو کەسانەی کە سوپاسگوزاری یەزدان نین) وشەی یەزدان بە مانای یەکتا پەرستیە، دەتوانین وای گریمانە بکەین کە دێو، لە ڕووی ژیارییەوە، بە چەند پلەیەك لە خەڵك دواکەوتووتربوون: ئەو چیانشینانەن کە بەڕاو شکار ژیاون و ئەشکەوتیان کردۆتە نیشتەجێی خۆیان، یان وەك تیرەو خێڵی ئەمڕۆکە، گەرمیان و کوێستانیان کردوەو، زیاتر تەمەنیان لەنێوچیادا بەسەربردووە. ئایا ئەشکەوت، نموونەیەکی چادرنیشانی ئەو سەردەمەنیە؟

هەر بەپێی دێرە شیعرەکەی فیردەوسی، دێو مرۆڤ گەلێك بوون کە لە باری جۆری ژیان و داب و نەریتی باوو باپیرانیانەوە پێ داگریان کردوە. ئەوان لەگەڵ ژیانی تازەی گوندنشینیو جوتیاری و خانووکردندا نەسازاون.

(ئەو کەسەی لەسەر ڕێگای خەڵکی نەڕۆشت) ئەو کەسەی هاوڕێگای خەڵکی نەبووە، واتای هاوڕێگایی چیە؟ لە بیروباوەڕی ئاینیدا؟ لە شێوەی ژیاندا؟ بەراشکاوی دەتوانین بڵێین کە دێو مرۆڤ گەلێك بوون، لە قۆناغێکی ژیانی مرۆڤایەتیدا، شێوەژیانێکی تایبەتی خۆیان هەبووە، وەك ئەنجامیش باوەڕی تایبەتی خۆیشیان هەبوە.

بەپێی داستانەکانی شانامەو ئەفسانە کۆنەکانی ئێران کە ڕەگیان لە مێژووی ژیانی مرۆڤایەتیدایە. دەتوانین ژینگەی دێو بەرجەستە بکەین.

(دێوی سپی) یەکێکە لەناو دارترین دێو کە لە ئەشکەوتەکانی مازندەراندا ژیاوە، بەپێی کۆنترین ئەفسانەی ئێرانی، دێو یان لە ناو ئەشکەوتا ژیاوە یان لە لووتکەی چیاو قەلا دورو تەریکەکاندا. لە ئەفسانەی "گوڵ خەندان"دا، ئەو دێوەی گوڵ خەندام دەفرێنێت، دەیباتە سەرچیایەك و لە قەڵایەکی دووره دەست زیندانی دەکات. لە ئەفسانەی ((نمدینە))دا کە لە ئەفسانە جوان و کۆنەکانی ئێرانە، نمدینە کچێکی جوان و میهرەبانەو بەدوای هەندێك خوری کێویدا دەگەڕێت، لە ئەشکەوتێکەوە سەر دەردەکات کە دێوێکی تیا دەژی. نمدینە گوندیەو لە دێدا نیشتەجێیەو ئاژەڵداری دەکات، دێوەکە لە ئەشکەوتایەو لە ژیانی مرۆڤ تەریکە. ڕەفتاری دێوەکە لەگەڵ نمدینەدا بەر خوردێکی مرۆڤایەتی و دانایانەو ڕەفتاری مرۆڤایەتییانەیە. دێوەکە ڕێز لە ئەقڵ و ڕەفتاری مرۆڤایەتیانەی نمدینە دەگرێت و هاوکاری دەکات، تا لەکاتی پێکەنیندا دەستە دەستە گوڵ لەدەمی بێتەدەرەوە، خۆر لەناو چاویەوە بدرەوشێتەوەو مانگیش بە چەناگەیەوەبێت. لە بەرامبەریشدا کچێکی کاڵفام و نەزان کە کەوتۆتە دوای خوری و سەری لەو ئەشکەوتەوە دەرکردوە، بەسووکی لە دێوەکە دەڕوانێت و گاڵتەی پی دەکات.

پێش ئەوەی گەلی ئاریایی، کۆچی فراوانیان بەرەو دەربەندە سەرسەوزو پڕ ئاوەکانی ئێران دەست پێ بکەن، کەسانی ناوچەکەو دانیشتوە ڕەسەنەکانی ئەو وڵاتە، لەکەنار کانیاوو لە ناودڵی دەربەندە بە بژێوەکان و ڕەنگە لە دڵی ئەشکەوتەکاندا ژیابن. ئەوانە خەڵکانێکی چیانشین و زبر و بەهەیبەت بوون، ڕیش و سمێڵی درێژو پەیکەری بەخۆوەو پێستی ئاژەڵیان دەپۆشی، لەوانەیە بە هەمان ئەو کلکەوە کە بەپێستەکەوە شۆڕبووەتەوە کلاویشیان سەری گاکێوی بوو بێت بە شاخەکانیەوە. دوور نیە ئاریاییە کۆچ کەرەکان کە تاڕادەیەك شارستانی، واتا ئاشنای کشتوکاڵ و گوندنشین بوون، لەگەڵ دانیشتوە ڕەسەنەکانی ئەم وڵاتەدا یەکخەگیرو بەرەنگاری یەکتر بووبێتنەوەو ئەمەیش لە ئەفسانەکاندا ڕەنگی دابێتەوە.

ئەفسانەیەکی زۆر کۆن هەیە ئەمە ناوەڕۆکەکەیەتی: (( لە کۆشکی پاشایەکدا، دارسێوێك هەبوە کە ساڵی سێ سێوی سووری بۆن خۆش و گەورەی گرتوە (پێ دەچێت سێوەکان دزرابن) شا فەرمانی دەستگیرکردنی دزە دەدات، سێ کوڕی پاشا بەدوای یەکتردا پاسەوانی لە دارەکە دەکەن. لەدواییدا کوڕی هەرە بچوکیان بۆی هەڵدەکەوێت و دزەکە بریندار دەکات، ئاسەواری خوێنەکە هەڵدەگرن، تا دەگەنە سەر لووتکەی کێوێك و پاڵ چاڵێك، کوڕە بچووکەکە دەڕواتە چاڵەکەوە، ئەشکەوتێك دەبینێت جێگای دێوێکە کە سێ کچی لەوێدا زیندانی کردوە، لەبەرئەوەی قایل نەبوون شووی پێ بکەن و چیرۆکەکە هەروا دەڕوات...

لە زۆربەی ئەفسانەی ئێرانیدا شوێنی نیشتەجێی دێو "ئەشکەوت"ە، لەو ئەفسانانەدا کە دێو یەکێکە لە کەسایەتیەکانی، خاڵێکی هاوبەش هەیە، ئەویش ئەوەیە کە دێوەکان لە شارو گوندەکانەوە کچ دەدزن، لە ناوجەرگەی چیاکاندا دەیانبەنە ئەشکەوتێکەوە، داوا لە کچەکەدەکەن بەو پەڕی مەیل و ڕەزامەندی خۆیانەوە شوویان پێ بکەن یان پەیوەندیان لەگەڵدا ببەستن، ئاسایی هیچ کچێك بەو پەیوەندیە قایل نیەو هیچ دێوێکیش بە زۆر کچە فڕێنراوەکە ناکاتە هاوسەری خۆی. پێ دەچێت بەدەربڕینێکی سەمبولی و ڕاز ئامێزانە، مەبەست ئەوە بێت کە خەڵکانی چیا



نشین ویستبێتیان پەیوەندی لەگەڵ گوند نشیندا ببەستن کە لە ناوچەیەکی جوگرافیدا نیشتەجێی هەمیشەیین و سەرقاڵی کشتووکاڵ و ئاژەڵدارین. هۆی نکووڵیکردنی کچەکانیش لەو شووکردن و پەیوەندیەدا، ڕەنگە ئەو مانا ڕەمزیەی هەبێت کە چیانشینان ئامادەنین واز لە شێوەی ژیانی باوك و باپیریان بهێنن. بەپێی شیعرەکەی فیردەوسی ((ئەو کەسانەی سوپاس گوزاری یەزدان نین)) ئەوانەی کە ناوی دێویان لێ نراوە یەکتاپەرست نەبوون و لەوانەیە چەند خوداوەندێکی جۆراو جۆری ئاسمانیان پەرست بێت، وەك (ئاناهیتا)ی خودای باران و کشتوکاڵ و (ڤا) خودای باو (میهریان میترا)ی خودای ڕوناکی و شەڕو پەیمان و بەڵێن.

لەپێش زەردەشتا خەڵکیی ڕەسەنی ئێران بڕوایان بەچەند خودایەکی ئاسمانی هەبوە، وەلێ لە هەموو سەرزەمینی ئێرانداو بەدرێژایی مێژوو نەریتی بت پەرستی لەم وڵاتەدا نەبوە. میتراو ئاناهیتا و خوداکانی تر میتافیزیك و ئاسمانی بوون، کە پاشان لە سەردەمی کرانەوەو ئاینی یەکتاپەرستی زەردەشتا، ئەو خودایانە کەوتنە پلەی دوەمەوە. لە ڕاژەکردن و لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتەدا، لە دیدی مێژوو کۆمەڵگاوە ئەوە دەردەکەوێت کە سیستمی بەڕێوەبردنی گوندوشار پێشتر ئەنجومەنێك بوەو سەرۆك خێڵەکان ڕەوتی ژیانی خەڵکیان بەرەو پێش و ڕابەری کردوە. ئەمەش لە بەڕێوەبردنی تاکە کەسێکدا کۆبوەتەوە کە (شا) یان (کوێخا)یە.

وەلێ کەلتورو باوەڕی مرۆڤ ژیانێکی دوورودرێژو ڕەگاژووی هەیە، ئەوەنیە کە باوەڕی خەڵکی لە چەند سەدەیەکدا ئاوەژوو بوبێت و ماهیەتێکی دی پەیدا کردبێت. شەڕی نێوان کۆن و نوێ شەڕێکی بەردەوام و تەمەن درێژە. کۆن دەبێت بەنوێ و نوێش بە کۆن. دێو لە ئەفسانەی ئێراندا نموونەی توندوتیژیە. هەیبەتێکی ترسناکی هەیە، بۆ گەیشتن بە ئامانجی خۆی پەنا بۆ زۆروستەم دەبات. ئەو کەسی گفتوگۆو بەزاراوەی ئەمڕۆ (دیالۆگ) نیە، لە ناکاوێکدا لە نیو دڵی گەرداوو زریانێکدا پەیدا دەبێت و بووك دەفڕێنرێت. بووك واتا دیمەنی جوانی و ڕەمزی وەبەر هێنان، دێو سروشتی ئاڵۆزیان نەبوەو بە ئاسانی فریویان خواردوە. بێ ڕووپۆش و ڕاست و ڕەوان بوون و لە کەڵەك و فێڵو فەرەجیان نەزانیوە. لە زۆربەی ئەفسانەکاندا خەڵکی شار کە نموونەیان شازادەیەك بوە، بە ئاسانی فریودراون، تەنانەت گوند نشینەکانیش کڵاویان لەسەر ناون، لە یەکێك لەو ئەفسانانەدا وا هاتووە کە چەند دێوێك لە قەڵایەکی چەپەکدا دەژیان. پیرێژنێك لەگەڵ کوڕێکی ئاقڵ و کوڕێکی تریدا کە ناتەواو بوە دەگەنە شوێنی دێوەکان. بە یارمەتی کیسەڵێك و دەنگی دەهۆڵ و کلکی کەر دێوەکان لە شوێنەکەیان دەتەرێنن و دەست بەسەر قەڵاکەدا دەگرن، لە هەندێك چیرۆکدا لەوانە چیرۆکی (ئەکوانی دێو) دێو بە ئاسماندا دەفڕێت. ئەمەیان لە کەسایەتی دێودا نهێنیەکی ئاڵۆزەو دەبێت کاری لەسەر بکرێت. ئایا فڕین بە مانای بەرز بوونەوەیە بۆ سەر لووتکەی چیاکان؟ بۆ ئەو ئەشکەوتە دوورو تەریکانەی کە گەیشتنی خەڵکی شارو گوند بۆ ئەوێ دور بوە لە مەیل و ئارەزوویان؟ لەگەلێك ئەفسانەدا دەبینی کە شووشەی تەمەن و ژیانی دێو لە سەری بزنە کێویەکدایە و بە کوشتنی بزنەکە گوڵی ژیانی ئەویش کۆتایی پێ دێت. ئایا ئەم بابەتە دەربڕینێکی سەمبولی بۆ مەسەلەیەك نیە کە ژیانی دێوەکان لەناو جەرگەی چیاکاندا پەیوەندیەکی تۆکمەی بە ڕاوو بە تایبەتی بە بزنە کێویەوە هەبێت



کە گوڵ خۆراکی ئەسڵی ئەو بوە؟ لەو ڕوانگەیەوە کە لە مۆرو سنجاق و خەنجەر و ئەو ئاسەوارانەی لەو سەردەمانەوە بەدەستمان گەیشتوە، وێنەی بزنە کێویەك دەبینی کە شاخە جوانەکانی تا مۆرەغەی پشتی کشاوە.

ژیانی شارنشینی لەگەڵ ژیاریدا پەیوەندیەکی پتەویان هەیە کە جێی قسە لەسەرکردنە، لەهەر جێگایەکدا کۆمەڵە کەسێك پێکەوە بژین و بەشێوەی دەستەجەمعی ڕۆژگاریان بەسەر بەرن، بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتی ژیانەکەیان، پێویستیان بە گفتوگۆو ڕاگۆڕینەوەیە، ڕەگی کلتوری توندوتیژی لە پەیوەندی خێڵ و تیرەدایە. سەرەکی ترین تایبەتمەندی سروشتی ئێران لە زنجیرە چیای ترسناك و سەخت و بیابان و جەنگەڵەکاندا خۆی دەبینێتەوە. لە داوێنی چیای سەرکەش و پڕ لە هەیبەتی ئێراندا لەوەڕگای سەوزو خۆش هەیە، لە مانگی بانەمەڕو جۆزەرداندا لە درزی نێوان سەخترین تاشە بەردا جوانترین و قەشەنگ ترین گوڵە کێوی سەردەردێنێ: بەردوسەوزە ((دێو و مرۆڤ))کانی و لافاو ((ئاهوراو ئەهریمەن))ی دارستان و زەوی شۆراو ((فریشتەو شەیتان))ن.

لە زمانی کوردیدا ئەفسانەیەك هەیە بەناوی (سەوزپۆش) پوختەی ئەفسانەکە بەم جۆرەیە. پیرەمێردێکی جوتیار لە



کێڵگەکەیدا لەگەڵ کیسەڵێکی قسەکەردا پێك دەگات و دەیباتەوە بۆ ماڵەوە. ڕۆژێك کیسەڵەکە داوا لە ژنی جوتیارەکە دەکات خوازبێنی کچی شای بۆ بکات، بەڵام ژنی جوتیار مل نادات، لە دواییدا ناچاردەبێت بڕواتە کۆشکی شاو خوازبێنیە سەیرەکەی خۆی بکات، پاشا دەست بەڕوویەوە نانێت، بەڵام بەو مەرجەی تا بەیانی کیسەڵەکە کۆشکێك بۆ کچەکەی دروست بکات، خشتێکی لە زێڕو یەکێکی لە زیو بێت، باڵندەیش بە جۆرێك بەری ئاسمان بگرن کە خۆر بەر شازادە خانم نەکەوێت. بۆ ڕۆژی دوایی لە نێوان سەرسامی هەمواندا کۆشکێکی سەرسووڕهێنەر وەك لە دایك بوونی ئەستێرەیەك دەکەوێتە بەر چاوی خەڵکی و باڵندەیش تەواوی ڕووی ئاسمان دادەپۆشن.

شازادەخانم لەگەڵ کیسەڵەکەدا زەماوەند دەکات، ڕۆژی زەماوەند لاوێکی جوان و دلۆڤان لە قاوغی کیسەڵەکەوە دێتە دەرێ، ڕۆژێك شازادەخانم کە هاوسەرەکەی لەوێ نابێت، قاوغی کیسەڵەکە فڕێ دەداتە ناو تەنوورەوەو دەیسوتێنێت. هاوسەرەکەی پێی دەڵێت ئەگەر بتەوێت بمدۆزیتەوە دەبێت حەوت پێڵاوی ئاسن بدریت و حەوت گۆچانی ئاسنیش کۆن بکەیت. دوای قسەکان ون دەبێت. شازادەخانم پەشیمان لە کارەکەی سەر بە دەشتی چۆڵ و هۆڵەوە دەنێت. سەرئەنجام مێردەکەی دەدۆزێتەوە، لەوێدا دەردەکەوێت کە هاوسەرەکەی کوڕی دەڵەدێوێکە، دێوەکە لە پێشی شازادەخانمدا تووڕە دەبێت و هەموو سەرزەمینەکە بە پەرپەرادەپۆشێت، لە بوکەکەشی دەخوازێت کە لە شەودا هەموو پەڕەکان گسك بدات. کوڕی دێوەکە هاوکاری شازادەخانم دەکات و هەموو تەنگژەکانی لە بەرپێی هەڵدەگرێ، دەڵەدێو شەکەت و ناچار قایل دەبێت شازادەخانم لەگەڵ کوڕەکەیدا بژی.

ئەم ئەفسانەیە قۆناغێکی تری ژیانی مرۆڤ پیشان دەدات. کوڕی دێوەکە نوێنەری نەوەی نوێیە. نەوەیەك کە بە پێی بڕواو نەریتی ڕابردوو (کیسەڵەکە ڕەمزی سەختی و بێداری)یە قەدەغەشکێنی کردووەو لەگەڵ شازادەخانمێکدا بوەتە هاوسەر. باوکی کچەکە تاك ڕەهەندەو حەزی بەو پەیوەندیە نیەو داوایەکی فرەسەخت لە کوڕی دێو دەکات کە بەدی هاتنی زۆر ستەمە. دروست کردنی کۆشکێك لە زێڕو زیو. کوڕەکە تەنگژەکان لەباردەبات، وەلێ لاوەکە تەواو لە ڕەگ و ڕیشەی خۆی هەڵنەکەنراوە و سەری لە قاوغی زەین و بۆنەی کۆندایە. کچی پاشایش کە هەر نوێ خوازەو لە بژارکردنی بۆنەی پێش کشتووکاڵیدایە. لە هەڵوێستێکی ئازاو شۆڕشگێڕانەدا، قاوغە سەختەکە دەسوتێنێت. کوڕی دێو بەرانبەر بەم کارە هەڵوێست گیری دەکات. دێوەکەیش پەنای دەداتێ و لە ئامێزی دەگرێت. لەگەڵ ئەوەیشدا کە قاوغەکەی سووتاوەو دێوەکە بەرگری دەکات. دەبێت نموونەی نەریت و بیری کۆن نەمێنن. هەولی دێوەکە بۆ بەردەوامی ژیان و پاراستنی بەهاو باوەڕی کۆن (قاوغەکە) هەوڵدانێکی بێ ئەنجامە. گەڕانەوە بۆ باوەڕو بۆنە کۆنەکان مەحاڵە. قاوغەکە سووتاوە و نەوەی نوێ کە لە کەولی ڕابردووەوە هاتۆتە دەرێ خوازریاری بارێکی تازەو بۆنەی نوێیە کە تەواو لە ڕابوردو جیاواز بێت. لە کۆتایی چیرۆکەکەدا گوێ لە دیالۆگی دێوەکە بگرن کە بە شیعر و بە زمانی کوردی هۆنراوەتەوە:

هەمە ریزو لولوریشە شەمامە
تۆ پاکەت هەڵگر، کارمەن تەمامە

سەرچاوە: www.persian-language.org

# مرۆڤی چیرۆك و چیرۆكی مرۆڤ

نوسینی: جەلیل ئازادبخواز

ناوو ناوبانگی یاقوتی لە جیهانی داستان و ئەدەبی ئێراندا بۆ کەس غەریبو نا ئاشنا نیە، یاقووتی نەك تەنها لە ئێراندا بەڵکو لە هەموو کوردەواری و دنیای دەرەوەشدا ناسراوەو جیهانی نووسین و چیرۆکی یاقوتی ئەمڕۆ ئیتر تێکەڵ بە کلتوری جیهان بووەو توانیویەتی سنورەکانی ئەدەبی ئێران بخاتە پشت سەرو لە گۆڕەپانی چیرۆکی جیهان دا بۆ خۆی ناوو ناسنامەی تایبەتی خۆی هەبێت.

تەمەنێك نزیك بە نیو سەدە ژیان لە ولاتی ئەدەب و تەعامولی چالاکانە و پیشەیی لەگەڵ نووسیندا بە تایبەتی هونەری چیرۆك وای لە یاقوتی کردووەو بە ڕادەیەك قاڵ و پوختەی کردووە کە بێ هیچ ترس و گومانێ دەتوانین بڵێین کە لەم ڕۆدا یاقوتی یەکێکە لە کۆڵەکە مەزن و ڕاوەستاوەکانی دنیای چیرۆکی ئێران و ڕواڵەتێکی ناسراوی جیهانی ئەم هونەرە.

ئەم نووسەرە بە تواناو پڕکارە هەر وەك خۆی دەڵێ تا قوڵترین قوڵایەکانی مێژووی کوردەو لە بنەماڵەیەکی کوردو بەکلتوری کوردی گۆشکراوە.

چرای ئەندێشەی یاقوتی بە بڵێسەی شانامەو بەیت و باوی کوردی دادەگیرسێو ئێستاش شەپۆلەکانی نۆستالۆژیا هەرکات دەیخەنەوە دەریای لە بڕان نەهاتوی ئەو چەشەو چەشنانەوە تەمەنێك لاو دەبێتەوەو دەستێك بۆ ئافراندن ڕادەکێشێ، لە دنیای ئەمڕۆدا کە دنیای پەیوەندی و گوێزانەوەی خێرایە جێگای خۆیەتی کە خوێنەرو نووسەری کورد لەگەڵ ژیان و بەرهەم و بۆچوونەکانی ئەم نووسەرە بەتوانایەدا ئاشنا بێت.

ڕاستە کە یاقوتی بە فارسی دەنوسێ و نووسیوویەتی، بەلام من بۆ خۆم هیچ گومانم نیە هەر کەس ئاسەوارەکانی بخوێنێتەوە بێ هیچ گرفت و تەنگەژەیەك هەناسەی کوردەواری دێت بەڕوویاو جوگرافیاو کەسایەتی و کەسەرو ئازار و ئاوات و ڕووداوەکان هەر هەموو شقڵی کوردەواریان پێوە دیارە و لەڕاستیدا هەر هەموو ڕواڵەتێ لە ڕواڵەتەکانی ولاتی کوردەواری دەردەخەن و ڕەگەزە کلتوری و ئاوەزیەکانی لە بازنەی جیهانی ژینی کوردەواریدا بە سانایی دەناسرێنەوەو پێناسە دەکرێن.

ڕوانینێکی خێرا بە ناو سیمای بەرهەمەکانی ئەم نووسەرەدا تەنانەت لە ڕواڵەتیشدا کوردین و شقڵی کلتوری کوردی و ولاتی کوردەوارییان پێوە دیارە. زام. گوڵ خاس. پێ جۆش. ئەفسانەکانی گوندنشینانی کورد. مادیان چیاو...هتد.

کۆیەکن لە ناوی بەرهەمەکانی یاقووتی و چۆنیەتی ئەم ناوانە و پێکهاتەی زمانیان ئەو ڕاستیە ڕوون دەکەنەوە کەسەر بە بنەماڵەی زمانی کوردی و جیهانو ژینی کوردەوارین. یاقووتی لە کاکڵەی ژیانی کۆمەلایەتیو بە ئەزموونی ڕئال و واقعی ژیانی خۆی و ئەو کۆمەڵەی کە تیایدا ژیاوە بەرەو دنیای نوسین و ئافراندنی چیرۆك ڕێکدەکەوێت.

ژیان تەجروبە دەکات و ئەم ژیانە تەجروبە کراوە کە دنیای بوون و واتا زەینی و ئاوەزیەکانی نووسەر ڕەنگ ڕێژ دەکەن بۆ یاقوتی لە دنیای چیرۆکدا جارێکی تر بەرگی بوون دەکەن بە بەرداو بە خوێندنەوەیەکی نوێدا بە لێکدانەوەی زومینەو باری مێژووی کۆمەلایەتی و لە یەك واتادا مرۆڤی هەموو پەیوەندو پەیوەستەکانیەوە ئامادە دەبێت و دێتە جیهانی بوون.

هەرێمی چیرۆکی یاقووتی هەرێمێکی کەسکە کە مرۆڤ لە پەیوەندی لەگەڵ سروشت وهەناوی نالێکدراوی خۆیدا ئامادەیەو لە ڕەوتی ئەزموونی ژیاندا دەبێتە هەڵگری مێژوو، هەموو ڕووداو دژوارو ئاڵۆزییەکانی بوون و مرۆیەکی لێکدراو لە سروشت، جیا بوونەوەو دابڕو، کەواتا زەینیەکانی دەکەنە بەر مەحەکی ئەزموونی کردەیی و عەینیەت بە خۆیان دەبەخشێت.

یاقووتی چیرۆك ناکاتە نموونەی پێشتر ئامادەو هەوڵ نادات کە ژیان بچەپێنێتە ناو ئەو نموونەو چوارچێوەیەوە، چونکە دەزانێ ئەم هەوڵە هەوڵێکی نەزۆکە. بە پێچەوانەوە یاقووتی لەبری ئەوەی

کە بە نموونەوە دەست بۆ چیرۆک بەرێ بە ژیانەوە بەرەو چیرۆک دەجووێت و لەم پرۆسە ئۆرگانیکە دایە کەدەست ئەداتە دۆزینەوەو دەرخستنی ژیان و هەڵگۆزینی ژین و ژیانی نوێ بە دەست هێنانی نموونە.

نازانم یاقووتی چەند لەگەڵ ئاوەزو ئەندێشەی کۆمەڵناسی ڕۆمانی جۆرج لۆکاچ ئاشنا بێت و نەبێ، بەڵام بە خوێندنەوەی کتێبەکانی مرۆ دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە ئەو پڕاوپڕ ڕەچاوی ئەم برگەیەی کردووە کە دەڵێ:

(ریالیزم نەخشەی ڕێنمای ئامادەو حازری مێژوو نیە، بەڵکو ڕێگای گۆڕانکاری مێژوو ڕوون دەکاتەوە).

نووسەر وەک خۆی دەڵێت و دەگێڕێتەوە مەکۆی سەرنجی خۆی کردۆتە ئالیزم و بەم شێوەیە نووسیویەتی دەنووسێ: بە باوەڕی پێشرەوانی ئەم ڕێبازەش ئالیزمی ڕاستەقینە و باوەڕ پێکراو کۆمەڵ و مرۆڤ تەنیا لە ڕوانگەیەکی لێکبراو تەک ڕەهەندەو زەینیەوە بەرجەستەو بەرچاو ناخات. بەڵکو هەردووکیان لە گشتیەتی ئافراندن و عەینیەتدا بەرجەستە دەکاتەوەو دەخاتە بەرچاو.

هەر لەم ڕوانگەیەوە دیارە کە نمایش و بەرجەستە کردنەوەی تەواوو هەموو لایەنەی مرۆڤ، کرۆکی ناوەکی ڕەگەزی سەرەکی ریالیزمە.

یاقووتی چ لە ئاخاوتن و چ لە خولقانە هونەریەکانیدا ڕاستەوخۆو لە مەکۆی ئەندێشەی جوانی ناسانەیدا ئەم ڕەوتەی گرتووەو هەوڵ ئەدا مرۆڤی مێژوویی لە پەیوەندی لەگەڵ هەموو ڕەهەندە مێژووییەکانیدا نمایش بکات.



پێشخوانی کلتوریو ئاوەزی دنیای ڕوناکبیری ئەم نووسەرەو دەتوانم بڵێم بە شێوەیەکی گشتی کۆمەڵەکەیی و لە دۆخێکی تایبەتی تردا ژیانی کەسێتی خۆی هەر هەموو ئەو فاکتەرو گرێ بەندانەن کە یاقووتی و دنیای چیرۆکی ئەویان بە ریالیزمەوە بەستۆتەوە.

ئەو وەک مرۆیەکی نا لێکدراوو دانەبڕاو لە سروشت منداڵی و مێرد منداڵی و تافی لاوی خۆی لە داوێنی سروشتدا داوەتە سەر، هەموو پەیوەندیە ساکارو ڕاستەوخۆکانی ژیانی دێنشینی و تەعامل لەگەڵ ژیانێکی ساکاری لەسروشت دانەبڕاوی تەجروبە کردووە.

ئەم تەجروبەو هەست کردنی کاریگەرێتی دەسەڵاتی ناسروشتی و دەرەکی لە دەرەوەی دەسەڵات و توانای ئەو ژیانێکی نا هەڵبژێردراوی بۆ ئەو وەک تیپ و نمونەی کۆمەڵایەتی ڕەنگرێژ کردووەو ئاوا بوون و دابڕانێکی نەخوازراوی بەسەریدا سەپاندووە.

یاقووتی لە ئاست ئەم دابڕانو سەپاندنەدا لەگەڵ فامکردنی هەموو میکانیزمەکانی دنیای دەسەڵات و چەوسانەوەدا ڕاوەستەیەکی قووڵ دەکات و دەیەوێ هەموو هۆو هۆکارەکانی دابڕانی مرۆڤ لە ژیانی ئاسایی و بێ چەوسانەوە بدۆزێتەوەو ئەو چەمک و ڕەهەندە سوارکراوانەی سەر جەوهەری بوونی مرۆڤ بخوێنێتەوە کە مرۆڤ بەرەو ئاڵۆزی زەبری نواندن و خۆ گرتن بە توندوو تیژیو سیفەتە نا مرۆیەکانەوە پەلکێش دەکات.

ئەو دەمەی کە یاقووتی دەکەوێتە نواندن و وەسفی ژیانی ناوەکی و دەرەکی مرۆڤ لەم ڕێگایەوە هەموو بوونی دەخاتە

بەرباس، زۆر بە وردی و هۆشیاری دەکەوێتە دۆزینەوەی پەیوەندییەکانی ئەم بوونەوەرەو هەموو خولقێنەرە بنەڕەتیە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکان و لێرەوە هەم وەسفەکانی جێگیر دەبن و هەم خۆی لە کەوتنە دنیای ناتورالیزمی ڕووتەوە دەپارێزێ و دەرباز دەکات،

دەکرێ کە بڵێم لەم ڕەوتەدا دەردەکەوێ کە بە شێوەیەکی بنەڕەتی و تەواو ڕیالیزمی فامکردووەو بەم فامکردنەش هەویایی خوێندنەوەی مرۆڤی هەیە.

دەزانین کە چیرۆکیش هەر وەك ڕۆمان ڕەگەزە سەرەکییەکەی بریتییە لە گێڕانەوە، واتە گێڕانەوە ڕۆڵی سەرەکی دەبینێ و عەینیەت کەمتر بەرجەستە دەبێتەوە. بەڵام یاقووتی لە کۆی چیرۆکەکانی خۆیدا و بە تایبەت لە (جوتیاران)دا جۆرە عەینیەتێك دەبەخشێتە گێڕانەوەکانی خۆی کە بەردەنگ و خوێنەر هەست دەکات لەگەڵ وێنەو پێکهاتەیەکی عەینی ڕووبەڕووە تا ڕووداو، یا چەمکێکی زەینی کە لە ڕێگای گێڕانەوەوە خەریکە تەجروبەی دەکات.

دیارە کاتێ کە خوێنەر ئەم هەستەی لا دروست ببێت کە ئەم گێڕانەوەیە عەینییە، واتە چیرۆك سەرکەوتوانە داڕێژراوە وەك دەڵێن پەرداخت کراوە.

جیهانی چیرۆکی نووسەر هەر وەك هەموو جیهانێکی بەمانا کۆ مرۆڤێ تیایدا هەڵدەسوڕێن و دەور دەگێڕن، ئەم کۆیە لە هەڵسوکەوت و جوڵانەوەی خۆیاندا پەیڕەوی لۆژیکێکی تا ڕادەیەك یەکگرتوون و لە چوارچێوەی دەقدا خۆیان پێناسە دەکەن و جیهانی خۆیان دەخولقێنن. گرنگی ئەم سوڕان و لۆژیکەی چیرۆکی مەنسوور مانا بە خشینە بە هەموو ئەو واتایانەی کە لە مرۆڤو جیهان ژینەکەی زەوت کراون و سەنراونەتەوە. ئەم مانا بەخشینە هەوڵێکی نەزۆکی زەینی نیەو تەنیا لە دنیای خەیاڵدا ڕوو نادەن. فەلسەفەی هەموو ئەدەب و هونەرەو ڕۆمان و کورتە چیرۆکیش زامنکردن و لێك دانەوەو هێنانە کایەی واتایەکە لە ژیان، کە لەم زامنکردن و لێکدانەوەو هێنانە کایەیەدا یاقووتی سەرکەوتووە.

چیرۆکی یاقووتی لە وەهمێکی خەیاڵاویدا وەیلانی شوێن هەرێمەکانی (ڕەنگەو شایەد نییە) و خۆی بۆ جوگرافیای وەقعی (ئەکرێ و ئەبێ) دەکوتێ.

نووسەر کە هەموو قەیرانەکان بەسەر دەکاتەوە مرۆڤ لە قەیراندا دەنوێنێ، بەڵام بە تەنیا لە قەیران دا بەجێی ناهێڵێ لە زەمەن و ژیاندایە کە قەیرانەکان دەست نیشان دەکات. ئەم زەیینیەتە ڕۆمانیەیە کە لای یاقووتی ئامادەیە جۆرە سفەتێکی ڕۆماناوی بەخشیوەتە چیرۆکەکانی و نامۆش نییە، چوون کە ئەو وەك چیرۆك نووسێك ئەزموونی نووسینی ڕۆمانی هەیەو خاوەنی ڕۆمانی گرنگی (جوتیارانە).

سی ڕەنگ یا ئەفسانەی سی ڕەنگ دەقێکە کە لە نێوان کورتە چیرۆك و ڕۆمان دا ڕاوەستاوە هەرچەندە چۆنیەتی داڕشتن و ئەو لۆژیك و ئەندێشەییەی کە جیهانی ئەم دەقەی خولقاندووە زۆرتر لە ڕۆمان نزیکی دەکاتەوەو شانی بەرەو ئەو ئاسۆیە پێ هەڵدەکێشێ بە تایبەت چۆنیەتی ئاوا بوونی قارەمان و چارەنووسی نادیاری کە ڕەنگە لە دەق و کات و سات و دەرفەتێکی تردا بۆ ڕەنگ ڕێژکردنی مێژوویەکی ترو واتایەکی تر لە بوون دەرکەوێت و خۆی بنوێنێ.

((باڵندەیەك بە ئاسمانی زەلکاوەکەوە پەرەندەیەکی تری شکارکرد، هاواری باڵندە بەرز بووەوەو پەرە خۆڵەمێشیەکانی لە ئاسمانی زەلکاوەکەدا بەسەر ئاوەکەوە بڵاوبوونەوە. سی ڕەنگ بە زۆری چەك تاڵانی بەرەو پێشەوە گلان. تاڵان هەنگاوێکی دیکەی بەرەوبەر نا هەستی کرد ژێر پێی خاڵی دەبێ. بە ترس و شڵەژاوییەوە کەوتە دەست و پێ کوتان، دەستی بۆ گڵاوگیا بێ ڕیشەو لاوازەکان دەکێشا و بە خێرایی ڕۆ دەچوو، زەلکاو لە ژێر پرشنگی زیو کفتی مانگ دا پارووی خۆی هەڵدەلووشی. سی ڕەنگ دەمانچەکەی لە ژێر پشتوێنەکەیدا جێگیر کرد، تاڵان تا سەرو مل لە ناو زەلکاودا ڕۆچوو بوو هاواری ئەکرد.

سی ڕەنگ ڕزگارم کە...

سمۆرەیەك بە چاوانی گەوڕەو پڕ پرشنگەوە لە سەر لقێ بەرەو لقێکی تر بازیدا. سی ڕەنگ پشتی کردە زەلکاوەکەو دوور کەوتەوە، زایەڵەی حیلەی ئەسپێ لە گوێی تاڵاندا زرایەوە، وا هەستی کرد ئەسپێکی بەهێزو ئەندام مەزن بە کۆکایە سوورە یاڵەوە لە هەناوی مانگەوە هاتە دەر، بە ئاسمانی زەلکاوەکەدا سوڕێکی خوارد و ئەوسا لە قەراغ زەلکاوەکەدا کەوتنە جمان.

ئەسپ لە بەینی درەختەکانەوە هەستایە سەر پاش و زڕانەوەی حیلەی بە ئاسمانی زەلکاوەوە شەپۆل کەوتە بزاوت و ئەوسا لە چاشیوێکی تەمدا لە نێوان درەختەکان دا کەوتە ڕێ هاوڕێی نەرمە شەماڵێ کە هەڵی کردبوو یاڵە سوورەکانی کەوتنە شنە.

سی ڕەنگ لە بوارەکە پێچی کردووە)).

ئەم کۆتاییە تەماوییەو نەکردنەوەی گرێی چارەنووسی سی ڕەنگ وا دەکات کە ئەم هەستە سەر هەڵبدات کە سی ڕەنگ دێتەوەو بە پێی ڕوانگەی یاقووتی ناکرێ ئەم قارەمانە لە قەیران دا بمێنێتەوە. چۆنێتی مامەڵەی یاقووتی و جیهانی دەقی سی ڕەنگ لە گەڵ کەسایەتیەکان لە ڕەوەندی بوون دا نەك بە تەنیایی و داماڵراو لە هەموو هەڵگرو پەیوەندییە مێژووییەکانی خۆی.

خولیاو غەموو دڵە ڕاوکێکانی نووسەر خولیاو غەموو دڵە ڕاوکێی کلتوورو جوگرافیاو ژینگەیەکە کە تیایدا ژیاوە و کەسایەتی و بۆچوون و هەویاکانی ڕەنگ ڕێژکردووە، بە واتای خۆی کوردبوونی تاسەر ئێسقان وایلێکردووە کە تا سەر ئێسقان وەیلانی شوێن غەمەکانی ئەم مرۆڤە بێتو لە دەقەکانی دا پەیوەندی نێوان کەسایەتی و شوێنگە ئەوەندە ئۆرگانیك و تۆکمەیە

کە بە هیچ جۆرێ پێویست بەو هۆهێنانەوە ناکات تا لە ڕێگەیەوە بە شوێن جوگرافیاو ڕووداوو کەسایەتیەکان دا بگەڕێین.

((برسێتی شەوانە ناچاری کرد لە دووندی چیاوە بەرەو دۆڵی گڵە زەرد بەربێتەوە، لە کۆتایی دەرەدا گووندی گڵە زەرد پاڵی دابوویە چیاوە کە بیست ماڵێ زیاتر نەدەبوو).

یا (پێش ئەوەی هەتاو لە بەرزاییەکانی زەردەوە سەر هەڵبدات سی ڕەنگ ماڵئاوایی لە هاوبوندییە کۆنەکەی کردو لە قەراغ باخەکانەوە ڕێی دەرەوەی شاری گرتە بەر. سی ڕەنگ بە بینینی دارە مەزن و گەورەکانی هەرمێو ئەو باخانەی کە تا چاو کاری دەکرد هەر درێژ دەبوونەوە بە خۆی ووت شارێکی ئاوەدانە تف لە سەروو سیمات کرماشان کە بوویتە گڵە جانە).

شوێن، کەسایەتی، کلتوور و هەموو لۆژیکی ئەم دەقە پڕاو پڕ لە کورستاندا دەخولقێت و لە سەر ڕێچکەی ژیان و بوونی زووڵمێ کار دەکات کە لە هەناوی کۆمەڵ و ئەم جووگرافیایەدا ئامادەیە.

لە چاخی مۆدێرن دا یاقووتی کەڵکەڵەی لێك دانەوەو توێژ کاری ڕواڵەت بەندی دەرەبەگایەتی لە ئەندێشەی دا بووتە چەقێکی گەورەو گرنگ. دەتوانین بڵێین کۆی بەرهەمەکانی ئەم نووسەرە هەوڵە بۆ خوێندنەوەو لێکدانەوەی ئەم ڕواڵەت بەندییەو مێژووی خولقان و سەرهەڵدانی ئەم دەزگاو ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیە ئابوورییە و کاریگەرێتیەك کە لەسەر مرۆڤی ئەم ژینگەیە دایناوە. بە واتایەکی تر مرۆڤێکی مێژوویی بە هەموو ڕەهەندوو لایەنەکانیەوە لە کۆمەڵگای دەرەبەگایەتیدا ئەو مرۆڤەیە کە یاقووتی دەیەوێ بوون و قەیران و هەموو واتا زەینی و عەینیەکانی بەرجەستە بکاتەوەو پێناسەیەکی بۆ دەستەبەر بکات.



نووسەر بۆ ئەم مەبەستە خۆ نزیك کردنەوە لە سنوورەکانی حەقیقەتی مرۆڤ لە ڕەوتی زەمەن و قەیران و ئامادەبوونی هەموو پەیوەندییەکانی دا ئەم بوونەوەرە دەکاتە مەکۆی سەرەنج و هەوڵ ئەدات پێناسەی بکات چونکە داماڵین و جیاکردنەوەی لە پەیوەندی و پەیوەستە مێژوویی و کۆمەڵایەتیەکانی بە هەڵە و نەزۆك دەزانێ.

وڵاتی دەق و چیرۆکەکانی یاقووتی وڵاتێکە کە مرۆڤی ئاسایی و لە سروشت دانەبڕاو دەخاتە بەر توێژینەوەو ڕەوتی گۆڕان و جیابوونەوەی زەینیەتی و ئەو میکانیزمانەی کە ئەم مرۆڤە ئاڵۆز دەکەن، دەبنە زامنی مانەوەی لە قەیران دا دەخاتە بەرباس. چاووگ و ئاخێزگەی چەوسانەوەو لەبیر چوونەوەی هەست کراوی لە سیستمی سیخناخ لە چەوسانەوەی دەرەبەگایەتی و سوڕانی سەر هەڵداوی سەرمایەدا ئەو هەویاگەورانەن کە یاقووتی بە دوایاندا دەگەڕێ. دەمەوێ بڵێم لەم جیهانی دەقانەدا یاقووتی بە تەمەنێ ئەزموون و بوونیەوە هەموو تواناکانی خۆی تەرخانی دۆزینەوەی مرۆڤ دەکات. لە دیواری گشت خوازی و لەبیر بردنەوەی مرۆڤ تێدەپەڕێ و بە چاوێکی پاژ خوازانەوە هەوڵ ئەدات کە ئەم سەردارەی سروشت بدۆزێتەوەو لەو دۆخەی کە دووچاری بووە،

کوێیە لە فارسە؟ ( هاوڕێیەکی لە بووشەهر) زەنگی بۆ لێدامو دەڵێ ڕۆمانی "دهقانان". دیارە ڕۆمانی دهقانان، ژیانی خەڵکی کوردە، لە ساڵەکانی ٤٢ی هەتاوی کە ڕیفۆرمی زەوی‌و زار لە ئێراندا ڕوو دەدا، لە یەکێك لە ڕۆمانەکاندا باسی دەکرێ‌و ڕەخنەگرانی نێو ئێران کە مامۆستای زانکۆشن، لە سەر ئەم کتێبە تەئکیید ئەکەن‌و وەك بەرهەمێکی چاك بەرگری لێ دەکەن. زۆر سەرنجڕاکیشە، ئەم کەسە کە تەلفۆنی کرد، باسی کاریگەری ئەم ڕۆمانەی بۆ کردم. کتێبەکانی من کە چاپ دەبن، ( چ دوێنێ‌و چ ئەمڕۆ) کە دوایین کتێبەکانم ئەوپەڕەکەی حەفتەیەك ماوەتەوە. یانی بە خێرایی دەفرۆشرێ، بێ ئەوەی پڕوپاگەندەی بۆ بکەم، نە کەس پشتم بگرێ، نە دەزگایەکی پڕوپاگەندەم هەبێ، بگرە هیچ کەس پێی وا نییە کە من ئێستا زیندووم. بێ ئەوەی خۆم تەنانەت یەك وشەشی لە سەر بڵێم بە خێرایی ئەچێتە نێو کۆمەڵگەی کوردەواری‌و کۆمەڵگەکانی دیکە، خوراسان، شیراز، ئەوانە لە ڕێگەی بەرهەمەکانی منەوە تەواو لە گەڵ ژیانی خەڵکدا ئاشنا بوون‌و تەنانەت لە سەردەمێکدا کە ڕۆمانی دهقانان‌و پێش لەوەش "چراغی بر فراز مادیان کوە"، هەر ئەم بەرهەمانە بوونە هۆی ئەوە کە ئەوان لە گەڵ خەڵکی کورددا ئاشنا بن. کتێبی "چراغی بر فراو مادیان کوە" کە ناوی سەرکێشێکی کوردە کە ناوی ئەسڵیشی (حاجی باجلان)ە. کەسێتییەکە وەك بنهور. سەرکێشێکی تایبەتمەند بوو، واتە دوای قازانجی خۆی نەکەوتبوو، دەچوو بە زۆری چەك سەروەتی لە دەوڵەمەندان وەردەگرت‌و بە سەر هەژاراندا دەیبەخشییەوە. خۆیشی هیچی نەبوو، ئێستا وێنەیەکی ئوستورەیی لێ دروست بووە. کورد بوو، من کردمە پاڵەوانی ئەم کتێبە. تەواوی کۆمەڵگەی ئێرانی وا لێکرد کە لە گەڵ خەڵکی کورددا هاوخەمی بنوێنن. جا ئەمە زۆر کاریگەرە.

***پ. ئاغای یاقووتی ڕاستییەکەی پرسیاری زۆرم لە مێشکدایە، بەڵام زۆر ماندووم کردی، ئەم گەشتە ئەدەبییەی بەڕێزت‌و دۆستان‌و ئوستادانی ناوچەی کرماشان بۆ هەرێمی کوردستان چۆنی هەڵ ئەسەنگێنێ، ئایا لە ڕووی ڕۆحی هەست‌و ئیحساسەوە چی لا دروست کردون‌و دەتوانن تەعبیری لێ بکەن؟***

و. ڕاستییەکەی ئەم پێوەندییانەی نێوان بەشە جۆراوجۆرەکانی کوردستان بە کولتوری جیاوازەوە بێگومان لە سەر زەینییەتی هەردوولا کاریگەری دادەنێ، ئەم گفتوگوو هەڵس‌وکەوت‌و پێوەندییانە دەبێتە هۆی ئاشنایی زیاترو تەنانەت دەوڵەمەندبوونی کولتوریی زیاتر، من بەڕاستی زۆر خۆشحاڵم، شتێکیش بڵێم، (شاهیدیشم هەیە) من بە هیچ شێوەیەك بەشداری لە فستیڤاڵەکانی ئێران‌و کۆڕە ئەدەبییەکانی هیچ شوێنێکدا ناکەم، من کە بەشداریم لە فستیڤاڵی بانەدا کرد، تەنیا لەبەرئەوە بوو کە فێستیڤاڵی بانە بوو، ئێستەش لە بەر ئەوەی کە ئێرە سلێمانییە، پایتەختی کولتوری کوردستانی ئازادە هاتووم، ئەگینا خزاومەتە سووچی



ماڵەوەو هەر لەو گۆشەگیرییەدا شتەکانی خۆم ئەنووسم. بۆیەش هاتم, چونکە بیستم دۆستان لە سلێمانی گلەییان هەیە، ئەم قسەیە گەیشتەوە گوێم کە هۆی چییە نایەم، منیش وتم تا نەمردووم بێم بۆ ئێرە.

***مانی: هەر بژیت, بەهیوای ئەوەی لە دەرفەتی تردا بتوانین وتووێژی زیاتر ئەنجام بدەین، زۆر سوپاست دەکەین.***

یاقوتی: منیش هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم.

---

**تێبینی:**

١. بۆ دیاری کردنی تەوەرەکانی ئەم گفتوگۆیە کاك جەلیل ئازادیخواز یارمەتی داوم، سوپاسی دەکەم.

٢. ئەم دیمانەیە، سەرەتا بە تایبەتی بۆ ڕۆڤار بە شێوەزاری کەلهوڕی ئەنجامدراوە، پاشان کراوە بە سۆرانی.

٣-فۆتۆکانی ئەم بابەتە بە کامێرای سەلام مستەفا گیراون.

